

لە بڵاوکراوەکانی
سەنتەری زەهاوی بۆ
لێکۆڵینەوەی فیکریی
(٣٢)

# دەروازەیەك سەبارەت بە
# هونەر
# لە هزری ئیسلامیدا




نووسینی: لوقمان بەهائەدین ئەحمەد خەتێ
مامۆستا لە کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکان
زانکۆی سەلاحەددین


دەروازەیەك سەبارەت بە هونەر لە هزری ئیسلامیدا

لوقمان بەهائەدین ئەحمەد خەتێ




سەنتەری زەهاوی
بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

# مدخل حول الفن
# في الفكر الإسلامي




المعهد العالمي للفكر
الاسلامي

# دەروازەیەك
# سەبارەت بە هونەر لە هزری ئیسلامیدا

**لە بڵاوكراوەكانی**

**سەنتەری زەهاوی بۆ لێكۆڵینەوەی فیكریی**





- نووسینی: لوقمان بەهائەدین ئەحمەد خەتێ
- بابەت: هونەر
- دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ڕەوشت محەمەد
- چاپخانە: (شڤان) ساڵی ٢٠١٥ كوردستان ـ سلێمانی

- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی كتێبخانە گشتییەكان
ژمارە (١٣٩٥)ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە

# دەروازەیەك
# سەبارەت بە هونەر
## لە هزری ئیسلامیدا

نووسینی
لوقمان بەهائەدین ئەحمەد خەتێ
مامۆستا لە کۆلێژی زانستە ئیسلامییەکان
زانکۆی سەلاحەددین

# ناوەرۆک

## پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە و درووود و سەلام لە پەیامبەری خوا و ڕەزای خوا لە تەواوی هاوەڵان و شوێنکەوتووانی تا ڕۆژی دوایی.

زۆرن ئــەو بابەتــە هــزری و شــەرعییانەی پێویــستیان بــە لێکۆڵینــەوە و خوێندنــەوەی نــوێ هەیــە، بــە هــۆی ئــەو نوێکــاری و گۆڕانکارییــەی لــەم سەردەمەدا ڕوویان داوە، کە ناکرێت هەندێ بابەت حوکمی سەردەمەکانی پێشوویان بۆ بدرێت، لەو کاتەی حوکمەکە لەسەر بنەمای ڕەچاوکردنی ژینگەی سەردەمەکە بڕیاری لەسەر دراوە و مەبەستەکانی ئەو سەردەمە تێبینی کراوە. کە ژینگە گۆڕا مەبەستەکانیش گۆڕان، پێویستە خوێندنەوەی نوێ بۆ بابەتەکان بکرێت، بۆ ئەوەی فیقهی شەرع لە فیقهی واقیع دانەبڕێت.

یەکێك لەو بابەتە هەستیارانەی ڕەچاوی ژینگە و مەبەستەکانی ئەو کاتەی بۆ کراوە و بڕیاری شەرعیی لەسەر دراوە، بابەتی هونەر و جوانییە لە شەرعدا، کە تا ئێستا وەکو پێویست لەسەری نەنووسراوە، بەتایبەتی بە زمانی کوردی، لەگەڵ گرنگی و بایەخی هونەر و کاریگەریی لەسەر ناسنامەی شارستانیەتەکان، بەڵام بە چەمکە گشتییەکەی زۆر کەمی لەسەر نووسراوە. هەندێك دەربارەی فەلسەفەی هونەریان نووسیوە بەبێ باسکردنی شەرعییەتەکەی، هەندێکی تر دەربارەی شەرعییەتی بەبێ باسکردنی ڕۆڵ و کاریگەری، هەندێکی تر دەربارەی بابەتێك لە بابەتەکانی، بە دەگمەن سەرچاوەیەکت بەر دەست دەکەوێت باسی هونەری کردبێت و شەرعییەت و ڕۆڵ و کاریگەری و فەلسەفە و مەبەستەکانی ڕوونکردبێتەوە.

زۆربەی توێژینەوە و نووسینەکانیش دووبارکردنەوەی حوکم و فەتواکانی سەردەمەکانی پێشوون، بێ ئەوەی ڕەچاوی ئـەو گۆڕانکارییانـە بکرێـت کـە بەسەر هونەردا هاتوون، یان ئەو ئەرك و مەبەستەی ئـەمڕۆ بـۆی ڕەخساوە، مەبەستەکانی هونەری وێنەکێشان و هەندێ جۆری گۆڕانی و مۆسـیقا لەگـەڵ سەردەمەکانی پێشوو گـۆڕاوە، هونـەرەکانی نوانـدن و سـینەما و شـانۆ بـەو شێوەی ئێستا بوونیان نەبووە، هەندێکی دیکە ئەو گرنگییە و کاریگەرییـەی ئێستا هەیەتی، لەو سەردەمانەی پێشوو نەیانبووە.

پــەیامی هونــەر و سروشــتەکەی، پەیوەنــدیی بــە جــوانی و دەربــڕینی هەستەکانەوە هەیە، بەڵام ئەو وێنە ناشیرینەی هونەر لەم ڕۆژگارەدا نیشانی دەدات، چــەمکی هونــەری ناشــیرین کــردووە، بــە تایبــەتی لــە ســەردەمی هۆکارەکانی پەیوەندی و جیهانگیریـدا، تـا لـە بـیری زۆرێـك لـە موسـڵمانانـدا هونەر بووەتە هاوڕێی شەیتان.

ئەگەر بەدواداچوونێك بۆ باسەکانی هونـەر لـە فیقهـی ئیـسلامیدا بکـەین، دەبیـنین بـە شـێوەیەکی سـەرەکی کورتکراوەتـەوە لـە بابـەتی گـوێگرتن (السماع)، یان هونـەرە دەنگییـەکان، کـە چـی چـەمکی گـشتیی هونـەر زۆر بـواری دیکـە دەگرێتـەوە، وەکـو: بیناسـازی و وێنەکێـشان و شـێوەکاری و پەیکەرتاشی و شانۆ و ڕەوانبێژی و چیرۆك و ڕۆمان...هتد.

مەبەست لەم نووسینە، یەکلاییکردنەوەی بابەتە هونەرییەکان نییە کە لە فیقهـی ئیـسلامیدا ناکۆکییـان لەسـەرە، بـەڵکوو تیـشك خـستنە سـەر ئـەم خاڵانەی خوارەوەیە:

١- دەرخــستنی ئــەو بــوارە هونەرییانەیــەی زانایــان کــۆکن لەســەر دروستییان، یان زۆرێك لە زانایان پێیان وایە دروستن و جیاکردنـەوەیان لـەو

بوارانەی ناکۆکییان لەسەرە، یان بە کۆی دەنگی زانایان حەرامن، بۆ ئەوەی ئەو تێگەیشتنە بڕەوێنینەوە کە وادەزانێت هونەر لە ئیسلامدا بە ڕەهایی حەرامە.

٢- ڕوونکردنەوەی بایەخ و گرنگیی هونەر و دەرخستنی کاریگەریی لەسەر تاك و کۆمەڵگە، ئەوەش وا پێویست دەکات موسڵمانان ئەو بوارە و ئەو ئامرازە بۆ خستنە ڕووی بابەتە شەرعییەکان و خزمەتکردنی مرۆڤایەتی و نیشاندانی کەموکوڕییەکانی هونەری ڕۆژئاوایی بەکاربێنن.

٣- تیشك خستنە سەر ئەو مەبەستە شەرعییانەی کە دەکرێت لە ڕێگای هونەرەوە بهێندرێنە دی، هونەریش بۆ پشتگیری کردنی ئەو مەبەستانە.

لە نووسینی ئەم بابەتەدا، پشتم بە توێژینەوەیەکی پێشترم بەستووە بە ناونیشانی(مقاصد الفن الاسلامی) و چەند توێژینەوەیەکی دیکەش کە لە کۆنفراسی هونەر لە هزری ئیسلامیدا پێشکەش کران، سەرەڕای گەڕانەوەم بۆ چەندان سەرچاوەی شەرعی و هونەری.

لێرەدا پێویستە سوپاسی (سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری) بکەم، کە پێشنیاری نووسینی ئەو بابەتەی بە زمانی کوردی کرد و ئەرکی چاپ و بڵاوکردنەوەی لە ئەستۆ گرت.

لە خوای گەورە داواکارم دڵسۆزیمان پێ بدات، کارەکانمان جوانتر بکات، لە کەموکوڕییەکانمان ببووریَ.

**لوقمان بەهائەدین/هەولێر**

١٧/ محرم/ ١٤٣٦ك

١٠/ ١١/ ٢٠١٤ز

# باسی یەکەم
# هونەری ئیسلامی لە زمان و زاراوەدا

بۆ ڕوونکردنـەوەی واتـای هونـەری ئیـسلامی، سـەرەتا پێناسـەی وشـەی (فـن) لـەزمانی عەرەبیـدا دەکـەین و جۆرەکـانی دیـاری دەکـەین، پاشـان پێناسەی هونەری ئیسلامی بە تایبەت دەکەین.

وشەی (فن) لە زمانی عەرەبیدا بە چەند واتایەك دێ، لەوانە: جۆری شت، بۆیە دەوترێت: (الرجل یفنن الکلام) واتە قسەکانی جۆراوجۆرن، (رجل مِفن) واتە: شتی سەرسوڕهێنەر دەکات، هـەروەها بـە گوێدرێـژی کێـوی دەوترێـت (الفنـان)، چـوونکە بـە چـەندان جـۆر و شـێوە ڕادەکـات، (فـن) بـە واتـای جـوانکردنیش دێـت، وشـەی (افـانین) واتـە: شـێوازەکان کـە بریتییـە لـە جۆرەکانی قسەکردن و ڕێگاکانی.[1]

[1] بڕوانە: لسان العرب، بەرگی: ١٣، لا: ٣٩٩-٤٠١

## هونەر لە زاراوەدا:

هونەر لە زاراوەدا زۆر پێناسەی بۆ کراوە، لەوانە:

١– ئەو کارەیە کە تایبەتمەندیی پیشەسازی و لێزانینی هەیە.

٢– بەرهەمێکی جوانییە کە مرۆڤی هۆشیار بەرهەمی دێنی و دەیخاتە سەر سروشت.[٢]

٣– دەربڕینێکی دیزاینکراو و داهێنراو و تۆکمەیە، هەڵقوڵاوی تێڕوانینێکی خاوەن کاردانەوەیە (انفعال) بە ئامرازێکی تایبەت و لە چوارچێوەی چەند ڕێسایەك بەپێی جوانی و هەستی بەرز.[٣]

لەو پێناسانەدا بۆمان دەردەکەوێت کە هونەر ئەم ڕەگەزانە لەخۆ دەگرێت: دەربڕین، جوانی، ئامراز، ڕێساکان.

## بەشەکانی هونەر

فەیلەسوفەکان هونەریان بۆ سێ بەش دابەش کردووە:

١– هونەرە ڕەوانبێژییەکان (الفنون الكلامية)، وەکو: ئەدەب بە هەموو ڕەگەزەکانیەوە، چیرۆك، هۆنراوە...هتد.

٢– هونەرە وێنەییەکان (الفنون التصويرية) وەکو: نیگارکێشان و هونەری شێوەکاری.

٣– هونەری جووڵەیی (الفنون الحركية) وەکو: سەما و گۆرانی و موزیك.

هەندێکی تر دابەشیان کردووە بۆ:

١- هونەری جووڵەیی (الحركية).

---

[٢] التربية الجمالية الاسلامية، لا: ٢٢.

[٣] الشريعة الاسلامية و الفنون، لا: ١٨

٢- هونەری بێدەنگی یان بێجووڵەیی (فن السكون) وەکو: بیناسازی و وێنەکێشان و پەیکەرسازی.

٣- هونەری شیعر.

هەندێکی دیکە دابەشیان کردووە بۆ:

١- هونەرە دەستییەکان (الفنون اليدوية).

٢- هونەرەکانی بینین (الفنون البصرية).

٣- هونەرە دەنگییەکان (الفنون الصوتية).[٤]

## پێناسەکردنی هونەری ئیسلامی

هونەری ئیسلامی پێناسەی زۆری بۆ کراوە، دیارترینیان پێناسەکەی (محەممەد قوتب)ە کە دەڵێ: دەربڕینێکی جوانە لە ڕاستییەکانی بوونەوەر، لە سۆنگەی ئیسلامەوە بۆ بوونەوەر.[٥]

لەو پێناسەدا ئەم ڕەگەزانەمان بۆ دەدەکەوێت: دەربڕین، جوانی، ڕاستییەکان (دووری لە ئەفسانە)، تێڕوانینی ئیسلام.

---

[٤] فلسفة الجمال و نشأة الفنون الجميلة، لا: ١٧٠.

[٥] منهج الفن الاسلامي، لا: ١١٩.

# باسی دووەم
# شەرعییەتی هونەر لە ئیسلامدا

دروستیی هونەر لە ئیسلامدا پەیوەستە بە ئامراز و ناوەرۆك و مەبەستەوە، ئەگەر ئامرازی هونەرەکە دروست بێ و ناوەرۆك و مەبەستەکەش پێچەوانەی دەقەکانی شەرع و مەبەستەکانی نەبێت، ئەوە بە هونەرێکی دروست لەئیسلامدا هەژمار دەکرێ، کە دەکرێ هەوڵ بدرێ بۆ گەلاڵە و بەرجەستەکردنی.

هەرچەندە هەندێ جۆری هەنەری هاوچەرخ لە ئیسلامدا حەرامن و هەندێکی دیکەش ڕاجیاییان لەسەرە، بەڵام ئەندازەیەك هەیە کە زانایان لەسەر دروستیی کۆکن، یان زۆربەیان بە دروستی دەزانن، ئەوەش لەبەر بوونی دەقی شەرعی لەسەر دروستیی، سەرەڕای هەبوونی ڕێسای فیقهی گشتی و مەبەستەکانی شەرع کە پشتگیریی لێ دەکەن. لێرەدا بەڵگەکان دەخەینە ڕوو کە دوو بەشن: بەشێکیان بەڵگەی گشتین لەسەر دروستیی جوانکردنی دەربڕین لە هزر و ناخی مرۆڤەکان لە سۆنگەی ئیسلامەوە، بەشەکەی دیکەش دەربارەی بەڵگە تایبەتەکان لەسەر حوکمی هونەرە هاوچەرخەکان.

## بەشی یەکەم: بەڵگە گشتییەکان:

**بەڵگەی یەکەم:** هونەر دەربڕینێکی جوانە لە هەست و هزر و ناخی مرۆڤەکان، دەربڕین و ڕوونکردنەوەی هزر و هەستی مرۆڤ بە شێواز و قاڵبێکی جوان و ڕازاوە، نیعمەتێکە خوای گەورەیە و منەتی پێ دەکا لەسەر مرۆڤەکان کە دەفەرموێ: (الرَّحْمَنُ ، عَلَّمَ الْقُرْآنَ ، خَلَقَ الْإِنْسَانَ، عَلَّمَهُ الْبَيَانَ ) [الرحمن: ١-٤] . واتە: خوای بەخشندە مرۆڤی فێری قورئان کردووە و خەلقی کردووە و فێری دەربڕینی کردووە لەوەی لە ناخ و دەروونیدایە.

کە وابێ هونەر دربڕین و ڕوونکردنەوەیە لە هەست و تێڕوانینی مرۆڤ بۆ بوونەوەر، پێغەمبەریشمان (ﷺ) هونەری شیعر و ڕەوانبێژیی حەرام نەکردووە و ڕەتی نەکردووەتەوە، ئەگەر پێچەوانەی شەرع نەبێ، بەڵکوو ئاماژەی بۆ کاریگەریی هونەری ڕەوانبێژی کردووە کە دەفەرموێ: ((ان من البيان لسحرا))[٦].

پێغەمبەر (ﷺ) شاعیرێکی هەبوو بەرانبەر شاعیرانی وەفدی عەشیرەت و هۆزەکان، وتاربێژێکی هەبوو کە لە سەرووی وتاربێژانی ئەوانەوە بوو، کاتێك قوڕەیش جنێویان بە پێغەمبەر دەدا (ﷺ) بە حەسانی کوڕی سابتی فەرمووﷺ: ((يا حسان أجب عن رسول الله (ﷺ) ، اللهم أيده بروح القدس))[٧]، واتە: ئەی حەسان وەڵامیان بدەوە لەجیاتی پێغەمبەر و

[٦] صحيح البخاري مع شرحه فتح الباري، بەرگی:١، لا: ٢٩١، ژمارەی فەرموودە: ٥٧٦٧، هەروەها: بەرگ:٩، لا: ٢٥٢، ژمارەی فەرموودە: ٥١٤٦.

[٧] صحيح البخاري مع شرحه فتح الباري، بەرگی١٠، لا: ٦٧٠-٦٧١، ژمارەی فەرموودە:٦١٥٢.

فەرمووی: خوایە پشتگیریی لێ بکە بە (روح القدس) واتە (جبریل) سەلامی خوای لەسەر بێت.

کە وابوو ئەگەر شێوازی دەربڕین دروست بوو، تێڕوانین و واتاکانیش هاوتا بوون لەگەڵ مەبەستەکانی شەرع، ئەو هونەرە دەبێتە باسکردن و بەرجەستەکردنی نیعمەتەکانی خوای گەورە، محەممەد عەمارە دەڵێ: "گەشەپێدانی هەستی جوانی (الاحساس الجمالي) لە مرۆڤی باوەڕداردا گەشەپێدانی تواناکان و بەهرەکانە، کە خوای گەورە بە مرۆڤەکانی بەخشیوە... ئەوەش دەبێتە سوپاسکردنی خوا لەسەر نیعمەتەکانی. بەکارهێنانی ئەم بەهرانە، ڕێگان بۆ خۆشی و چێژ وەرگرتن لە دروستکراوەکانی خوا لە بوونەوەردا، لە ئایات –نیشانەی–ڕازاندنەوە و جوانی و سوپاسکردنی خوا لەسەر نیعمەتی دروستکردنی ئەم ڕازاندنەوە و جوانییە، خوای گەورە دەفەرمووێ:( وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رِبِّكَ فَحَدِّثْ ) [الضحی: ١١] واتە: نیعمەت و بەخشینی پەروەردگارت دەربخە و باسی بکە، پێغەمبەریش دەفەرمووێ: ((ان الله یحب أن یری أثر نعمته علی عبده))[٨] واتە: خوای گەورە پێی خۆشە ئاسەواری نیعمەتەکانی بەسەر بەندەکانیەوە دیار بێت.

**بەڵگەی دووەم**: هونەر بۆ جوانی و بەرجەستەکردنی جوانی هەوڵ دەدات، جوانیش لە مەبەستەکانی شەرعە، کە وابوو ئەگەر هونەر جوانیی بەرجەستە کرد بەپێی تێڕوانینی ئیسلامی، ئەوە مەبەستی هونەر و مەبەستی شەرع یەك دەگرنەوە. چەندان دەقی قورئان و سوننەت بەڵگەن کە جوانی لە

[٨] الاسلام و الفنون الجمیلة، لا: ٢٠. و الحدیث أخرجه الترمذي و قال: حدیث حسن، بڕوانە:سنن الترمذي. مع شرحه تحفة الأحوذي، بەرگی: ٨، لا: ٧٤، ژمارەی فەرموودە: ٢٨١٩.

مەبەستەکانی شەریعەتە لە بوونەوەردا، هەر وەکو خوای گەورە دەفەرمووێ: (قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) [الاعراف: ٣٢] . واتە: ئەی محەممەد بڵێ کێ ئارایش و جوانییە خواییەکانی حەرام کردووە، کە خوای گەورە بۆ بەندەکانی دروستی کردوون، هەروەها کێ ڕۆزی و خۆراکە پاك و خۆشەکانی حەرام کردووە. بڵێ: ئەوە بۆ بڕوادارانە لە ژیانی دونیادا (بێ بڕوایانیش لە پەنای ئەوان بەشداری دەکەن) بەڵام لە ڕۆژی دواییدا تایبەتە بە بڕواداران.

هەر وەکو ئیسلام حەڵاڵی کردووە بۆ ئافرەتان کە خشڵ بەکاربهێنن بۆ جوانی، وشەی (حلی) واتە خشڵ، یان جوانکاری، کە لە ژمارەیەك لە ئایەتەکانی قورئاندا هاتووە، وەکو: (وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا و تَسْتَخْرِجُوا مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا و تَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ و لِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ و لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ) [**النحل: ١٤**] . واتە: ئەو خوایەیە کە دەریای ڕام هێناوە بۆ ئەوەی گۆشتی تازەی لێ بخۆن و خشڵیشی لێ دەربێنن کە دەیپۆشن بۆ خۆڕازاندنەوە، هەروەها کەشتییەکان دەبینن ئاوی دەریا لەت دەکەن بۆ ئەوەی هەندێ لە فەزڵ و ڕۆزیی خوا بەدەست بهێنن، بۆ ئەوەی سوپاسی خوایش بکەن.

هەروەها خوای گەورە ڕوونیکردووەتەوە کە یەکێك لە مەبەستەکانی جوانی بریتییە لە خۆشی و چێژ وەرگرتنی چاو و دەروون بە بینینی جوانییەکان، کە دەفەرمووێ: (وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا و زَيَّنَّاهَا لِلنَّاظِرِينَ) [**الحجر: ١٦**] . واتە: بێگومان ئێمە چەند بورجێکمان لە ئاسماندا دروست کردووە، ئەو ئاسمانەمان ڕازاندووەتەوە بۆ سەرنجدان.

خوای گەورە مرۆڤی بە جوانترین و تەواوترین شێوە دروست **کردووە** **(لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ) [التين: ٤]** . واتە: بە ڕاستی مرۆڤمان لە جوانترین شێوە خەلق کردووە.

هەر وەکو خوای گەورە باسی نیعمەتی ئاژەڵەکانمان بۆ دەکات و سەرنجمان بۆ جوانیی تابلۆکانی سروشت ڕادەکێشێت **(وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ و حِينَ تَسْرَحُونَ،و تَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلاّ بِشِقِّ الْأَنْفُسِ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رحِيمٌ ، و الْخَيْلَ و الْبِغَالَ و الْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا و زِينَةً و يَخْلُقُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ) [النحل: ٦-٨]** . واتە: دیمەنی جوان و ڕازاوە بۆ ئێوە لە ئاژەڵاندا هەیە، کاتێك دەیانهێننەوە لە لەوەڕگا و کاتێکیش دەیانبەن بۆ لەوەڕگا، وە هەندێ لەو ماڵاتانە بارەکانتان هەڵدەگرن و دەیبەن بۆ ئەو شار و جێگای کە ئێوە پێی نەدەگەیشتن مەگەر زۆر بە زەحمەت نەبێت، بەڕاستی پەروەردگارتان زۆر بە سۆز و بەزەییە، هەروەها ئەسپ و ماین و ئێستر و گوێدرێژی بۆ دروست کردوون، بۆ ئەوەی سواریان بن و هۆی جوانی و ڕازاندنەوەش بن بۆ ئێوە، خوا شتی وا دروست دەکات کە ئێوە -ئێستا- نایزانن.

سەید قوتب دەڵێ: "لە ئەسپ و هێستر و گوێدرێژدا، دابینکردنی پێویستی بۆ سواربوون هەروەها دابینکردنی هەستی جوانی لە جوانکارییەکان (لتركبوها وزينة) [النحل: ٨] بەدی دەکرێت، ئەو ئاوڕدانەوە بەهای خۆی هەیە لە ڕوونکردنەوەی دیدی قورئان و دیدی ئیسلام بۆ ژیان. جوانی ڕەگەزێکی بنەڕەتیە-اصیل- لەو دیدەدا، نیعمەت تەنیا دابینکردنی پێویستییەکان نییە لە خواردن و خواردنەوە و سواری، بەڵکوو دابینکردنی ئەو هەست و تامەزرۆییەیە کە زێدەیە لەسەر پێویستییەکان، دابینکردنی

هەستی جوانی و هەستی خۆشی کە بەرزدەبێتەوە لەسەر مەیلی ئاژەڵ و پێویستیی ئاژەڵ".[٩]

کە وابێ قورئان داوای هەست کردن بە جوانی و چێژ وەرگرتن لە تابلۆ هونەرییە جوانەکانی سروشت دەکات، بۆیە ناکرێ قورئان دژی هونەر بێت، چیرۆکی دوژمنایەتیی ئیسلام و هونەر، چیرۆکێکە ناکرێ هیچ بنەمایەکی ڕاست و دروستی هەبێت.

**بەڵگەی سێیەم**: لە فەرمودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) فەرمودەی زۆر هەن کە بەڵگەن لەسەر مەبەستی جوانی و جوانکاری، کە پێغەمبەر ﷺ سەرنجی موسڵمانانی بۆ ڕاکێشاوە، هەر وەکو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رضي الله عنه) لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە فەرموویەتی:

((لايدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر)). قال رجل: ان الرجل يحب أن يكون ثوبه حسناً، و نعله حسناً، قال: ((ان الله جميل يحب الجمال، الكبر بطر الحق و غمط الناس))[١٠] واتە: ناچێتە بەهەشت، کەسێك بە ئەندازەی گەردیلەیەك خۆبەزلزانینیی لەناو دڵدا هەبێ، پیاوێك گوتی: مرۆڤ حەز دەکات بەرگی جوان بێ و نەعلی جوان بێ، پێغەمبەر (ﷺ) لە وەڵامدا فەرمووی: بێگومان خوای گەورە جوانە و جوانیشی خۆشدەوێ، خۆبەزلزانین ڕەتکردنەوەی حەقە و بەکەمزانینی خەڵکە.

یەکێك لە ئەرکەکانی هونەر، گەیاندنی ئاست و جوانیی پیشە و پیشەسازییەکانە، بۆ پلەی تەواوکاری و ڕێکوپێکی، ئەوەش یەکدەگرێتەوە لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) ((ان الله كتب الاحسان على كل

---

[٩] في ظلال القرآن، بەرگی: ٤، لا: ٢١٦١

[١٠] صحيح مسلم بشرح النووي، بەرگی: ٢، لا: ٧٧، ژمارەی فەرموودە: ٩١.

شيء))[١١]، خوای گەورە ئەنجامدانی کارەکانی بە ڕێکوپێکی لەسەر هەموو شتێك واجب کردووە. هەروەها دەفەرمووێ: ((ان الله يحب اذا عمل أحدكم عملاً أن يتقنه))[١٢]، خوا پێی خۆشە ئەگەر یەکێکتان کارێکی ئەنجام دا، بە تەواوی و جوانی ئەنجامی بدات.

ئەوەی کە پێویستە لێرەدا ئاماژەی پێ بکرێ، ئەوەیە کە ئەو دەقانەی بەڵگەن لەسەر مەبەستی جوانی و جوانکاری، مانای ئەوە نییە کە چێژ وەرگرتن لە جوانی تەنیا مەبەستی جوانییە، بەڵکوو مەبەستی دیکەش هەن پێویستە ئاماژەیان پێ بکرێ، بۆ ئەوەی جوانی لە سنووری خۆی دەرنەچێ، چوونکە دەرەنجام لە سنووری مەبەستەکانی شەرع دەردەچێ. بۆ نموونە یەکێك لە مەبەستەکانی جوانی، تاقیکردنەوەی بەندەکانە، هەر وەکو لە چەندان ئایەتی قورئاندا هاتووە، وەکو: (إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا) [الكهف: ٧]. واتە: بەڕاستی ئێمە هەرچی بەسەر زەوییەوەیە، کردوومانە بە ڕازاندنەوە و جوانی بۆ زەوی، بۆ ئەوەی خەڵکی تاقی بکەینەوە کە کامیان کردەوەی جوانتر و چاکترە. هەروەها دەفەرمووێ: (وَلاَ تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ و رِزْقُ ربِّكَ خَيْرٌ و أَبْقَى) [طه ١٣١]. واتە: چاوەکانت مەبڕە ئەو ناز و نیعمەتەی داومانە بە تاقم و دەستەیەك لەوان (بێباوەڕان)، چوونکە

[١١] سەرچاوەی پێشوو، بەرگی: ١٣، لا: ٩٠، ژمارەی فەرموودە: ١٩٥٥.

[١٢] أخرجه أبو يعلى والبيهقي، مسند أبي يعلى، بەرگی: ٣، لا: ٤٠٠. ژمارەی فەرموودە: ٤٣٨٥، شعب الايمان، ژمارەی فەرموودە: ٥٣١٣، مجمع الزوائد و منبع الفوائد، بەرگی: ٤، لا: ١٢٢، ژمارەی فەرموودە: ٦٤٦٠، و صححه الألباني بمجموع طرقه، بڕوانە: سلسلة الأحاديث الصحيحة و شيء من فقهها وفوائدها، بەرگی: ٣، لا: ١٠٦.ژمارەی فەرموودە:١١١٣.

ئەوە زینەت و جوانیی ژیانی دونیایە، بۆ ئەوەیە تاقییان بکەینەوە تیایدا، دڵنیابە ڕزق و ڕۆزیی پەروەردگارت لە دواڕۆژدا چاکتر و بەردەوامترە.

کە وابوو بەکارهێنانی جوانی بۆ کاولکاری (فساد) و مرۆڤپەرستی و برەودان بە بیرۆکە و بیروباوەڕی ناحەق، لە چوارچێوەی جوانی دەری دەکات، چوونکە جوانیی دەربڕین بە بێ جوانیی ناوەرۆك و مەبەست، تەواو نابێ.

**بەڵگەی چوارەم:** چەند ڕێسایەکی ئوسوڵی و فیقهی هەن کە بە گشتی بەڵگەن لەسەر دروستیی هونەر، لەوانە:

١- ڕێسای ئەسڵ لە هەموو شتێك دروستییە نەك حەرامی "الأصل في الأشياء الاباحة"[13]، بەپێی ئەو ڕێسایە، هونەرە هاوچەرخەکان کە دەقی شەرعی لەسەر حەرامییان نەبێ، بە دروست دادەنرێن. ئەگەر ئەو هونەرانە لە بوارەکانی هزری ئیسلامی و بانگخوازی بەکاربێن، ئەوە حوکمەکەی بۆ (مندوب) دەگۆڕێ، واتە ئەنجامدانی پاداشتی هەیە، چوونکە ئەو کارانەی حەڵاڵن، ئەگەر موسڵمان مەبەستی خواپەرستی بێت و لە پێناوی خوا بیانکات، ئەوە پاداشتی لە بەرانبەردا وەردەگرێ. لە هەندێ بارودۆخ و شوێن و کاتدا، دەبێتە واجبێکی کیفائی، ئەگەر تەنیا ڕێگابوو بۆ بانگخوازی و گەیاندنی پەیامی ئیسلام.

٢- ڕێسای: هەر شتێك ئەنجامدانی واجیبی لەسەر وەستابێت، ئەویش واجیب دەبێت "ما لايتم الواجب الا به فهو واجب".[14] گەیاندنی پەیامی ئیسلام و دینی خوا واجیبە لەسەر موسڵمانان، هەروەها بڵاوکردنەوەی

[13] الأشباه و النظائر في قواعد و فروع فقه الشافعية، لا: ٢٠٨.

[14] القواعد و الفوائد الأصولية، لا: ١٠٢

زانــسته شــەرعییەکان و ڕەوشــتی بــەرز و جــوان. لــە هەنـدێ سـەردەم و بارودۆخدا ئەگەر نەتوانرا ئەو واجیبانە بگەیەنرێن تەنیا لە ڕێگای هونـەرەوە نەبێت، ئەوە بەکارهێنانی هونەر بەپێی ئەو ڕێسایەی باسمان کرد دەبێتـە واجیبێکی کیفائی.

لـەم سـەردەمەدا ئـەو ڕێسایە بەسـەر هونـەردا جێبـەجێ دەبـێ، کاتێـك دەبینین کەناڵـە ئاسمانییـەکان گشت ماڵێکیـان گرتووەتـەوە و لـە کـۆڵان و کووچەکان دانـراون و بیرۆکـە و هـزری چـەوت و نـاڕەوا لـە ڕێگـای بەرهەمـە هونەرییـەکانی وەکـو: دراما و گـۆرانی و فیلمـە سـینەماییەکان...هتـدەوە، بڵاودەکاتــەوە. لەبــەر ئــەوە بڵاوکردنــەوەی زانــستە شــەرعییەکان و بــەها ئیـسلامییەکان و وشـەی ڕاسـتەقینە لـە ڕێگـای هونـەر و پەخـشکردنی لـە کەناڵەکان، پێویستییەکی شەرعی و سەردەمییانەیە و جۆرێکە لە جۆرەکانی جیهادکردن بە زمان و سامان، کۆمەڵگە تاوانبار دەبێ بە فەرامۆشکردنی.

٣- ڕێسای: پێویـستییەکان مامەڵـەی زەرورەتـەکانیان لەگـەڵ دەکـرێ، پێویستییەکە گشتی، یان تایبەت بێـت (الحاجـة تنـزل منزلـة الـضرورة عامـة کانت أو خاصة).[١٥]

دکتـۆر (ئەحمــەد زەرقــا) دەربــارەی ئــەم ڕێـسایە دەڵــێ: "پێویـستی (الحاجــة)ئــەو حاڵەتەیــە، کــە پێویــست دەکــات ئاســانکاری بکــرێ بــۆ بەدەستهێنانی مەبەستەکەی، وەپلەی لە خوارەوەی زەرورەتـە، هەرچـەندە ئەو حوکمەی بـە پێویـستی(الحاجـة) جـێگیر دەبـێ، بەردەوامـە، بـەڵام ئـەو حوکمەی بە زەرورەت جێگیر دەبێ، کاتییە"[١٦].

[١٥]الأشباه و النظائر، لا: ١١٧

[١٦]شرح القواعد الفقهية، لا: ٢٠٩

هونـەر لـەم سـەردەمەدا زۆر جـار دەچـێتە ژێـر ئـەو ڕێـسایە، چـوونکە بەدەستهێنانی مەبەستە شەرعییەکان، پێویست دەکات هونەر دروسـت بـێ، چـوونکە هــەر شــتێك دەقێکــی شــەرعیی تایبــەتی لەســەر دروســتی، یــان نادروستی نەبێت و هاوشێوەی لە شـەرعدا هـەبێت، ئـەوە دەچـێتە ژێـر ئـەو ڕێسایەوە. هەروەها ئەگەر هاوشێوەشی نەبێ کە حوکمەکەی لەگەڵ یەکسان بکـرێ، بـەڵام سـوود و بەرژەوەنـدیی تێـدا هـەبوو، ئـەوە دەچـێتە ژێـر ئـەو ڕێسایە، هونـەریش لـەم سـەردەمەدا پێویـستییە و بەرژەوەنـدیی شـەرعی و دروست بەدیدێنی.

## بەشی دووەم: بەڵگە تـایبەتەکان

ئەندازەیەکی هاوبەش هەیە لە هونەر کە زانایان کۆکن لەسەر دروسـتیی، یان لای زۆربەی زانایـان دروسـتە، دەکـرێ لـەم خاڵانـەی خـوارەوە ڕوونیـان بکەینەوە:

### یەکەم: هونەرە دەستییەکان

ئەو جۆرە هونەرەیە کە مرۆڤ بە دەست بەرهەمی دێنی و داهێنـانی تێـدا دەکات، وەکو: نیگارکێشان و پەیکەرتاشی و زەخرەفە و خۆشنووسی.

ئەو جۆرە هونەرەش کاریگەریی لەسەر بیر و هەستی خـەڵکی هەیـە، زۆر جار هەڵوێستی مرۆڤەکان دەگۆڕێت. یـەکێك لـەو نموونانـەی ئـەو کارگەرییـە دەردەخات، بەسەرهاتی (محمد عالی)یە کە دەڵێ: "ژیانم پڕ بوو لـە هەڵـە و لادانی گەنجانە لە ڕووی ناوەرۆك و لە ڕووی شێوەی ڕواڵەتیـشەوە. شـێوەی ڕواڵەتم (هیئة) نزیکتر بوو لە شێوەی پیاوە چەتە و ڕێگرەکان، بـەڵام ئێـستا لە ژیانی ئیمان و هاوسەنگی و ویقار و تەقوادام".

محەممەد عالی دەستی کرد بە خوێندنەوەی قورئان و ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) ، ژیانی بە شێوەیەك گۆڕا کە بەراوردکردنی وێنەی ئێستای لەگەڵ وێنەی دوێنێی، جێی سەرسوڕمانە.

محەممەد عالی دەڵێ: "سەرەتای خاڵی وەرچەرخان لە ژیانمدا لەو کاتە ڕوویدا کە چیرۆکێکی پڕ لە واتا و پەندم لە یەکێك لە پەرتووکە وەرگێڕدراوەکان خوێندەوە، کە بە کورتی دەڵێ: یەکێك لە فەرمانڕەوایانی ئیتاڵیا داوا لە هونەرمەندێکی شێوەکاری بەناوبانگ دەکات لە بەردەرگای گەورەترین سەنتەری ڕۆحی لە وڵاتدا، دوو وێنەی جیاواز و دژبەیەکی بۆ دروست بکات، داوای لێکرد وێنەی فریشتەیەك و لە بەرانبەردا وێنەی شەیتانی بۆ دروست بکات، بۆ تێبینیکردنی جیاوازیی نێوان چاکە و تاوان. شێوەکارەکە هەڵسا بە گەڕان بە دوای سەرچاوەیەك و نموونەیەك بۆ ئەوەی شێوەی وێنەکانی لەسەر دابڕێژێ و واتاکانی لێ وەرگرێ. ڕۆژێکیان منداڵێکی سادە و جوانی بینی کە ئارامی و پاکی بەسەر ڕووخسارە سپی و بازنەییەکەیەوە دیار بوو، چاوەکانی نقومی دەریای بەختەوەری بوون. لەگەڵ منداڵەکە چووە لای کەسوکاری و داوای لێکردن کە ڕێی پێ بدەن بۆ ئەوەی وێنەی فریشتەکەی لە ئاکار و ڕووخساری ئەو منداڵە وەرگرێ.

بە دانیشتنی منداڵەکە هەموو ڕۆژێك لە پێش هونەرمەندەکە تا وێنەکەی تەواو بکات بەرانبەر بڕە پارەیەك، دوای مانگێك وێنەکە ئامادەبوو، کە بریتی بوو لە وێنەی ڕووی منداڵەکە بە جوانکاری و داهێنانی هزر و بەهرەی هونەرمەندەکە، ئەوەش خەڵکی سەرسام کرد، چوونکە لەو سەردەمەدا وێنەی وا جوان و داهێنراو نەکێشرابوو.

پاشان هونەرمەندەکە بەدوای کەسێکی دیکەدا گەڕا کە بیرۆکەی وێنەی شەیتان لەسەر ڕووخساری جێبەجێ بکات، چوونکە بە جیددی بە کارەکەی هەڵسا، بۆیە زۆر گەڕا، بەڵام کەسێکی وای دەست نەکەوت، پاش زیاتر لە بیست ساڵ گەڕان، فەرمانڕەوا لەوە ترسا کە هونەرمەندەکە بمرێت پێش ئەوەی گەوهەرە مێژووییەکەی تەواو بکات، بۆیە بڕیاری دا بە تەرخانکردنی خەڵاتێکی گەورە و گرانبەها بۆ خاوەنی ناشیرینترین و ترسناکترین ڕوو کە گەردیلەیەك مرۆڤایەتی و ڕەوشتی لێ بەدی نەکرێت. هونەرمەندەکە سەردانی بەندیخانەکان و نۆرینگە دەروونییەکان و مەیخانەکان و شوێنی تاوانبارانی کرد، بەڵام هەموویان مرۆڤ بوون، نەك شەیتان.

ڕۆژێکیان هونەرمەندەکە ئەو شەیتانەی دۆزییەوە کە بەدوایدا دەگەڕا، پیاوێکی ڕەوشت خراپ بوو، لە قوژبنێکی تەنگی مەیخانەیەکی پیسدا شووشە شەرابێکی لە دەستدا بوو، هونەرمەندەکە لێی نزیك بووەوە و باسی بابەتەکەی بۆ کرد و پەیمانی پێ دا پارەیەکی زۆری پێ بدات، پیاوەکەش ڕازی بوو. دیمەنی پیاوەکە زۆر ناشیرین بوو، بۆنێکی پیس و ناخۆشی هەبوو، چەند موویێك لە ناوەندی سەریدا هەبوون هاوشێوەی قۆچی شەیتان، گرنگیی بە هیچ شتێك نەدەدا، بە دەنگێکی گەورە قسەی دەکرد، دان لە دەمیدا نەمابوو. فەرمانڕەوا کە هەواڵەکەی زانی، زۆر دڵخۆش بوو، چوونکە دۆزینەوەی کەسێکی وەها، دەبێتە هۆی تەواوکردنی شاکارە هونەرییەکەی بەردەرگای کۆشکە ڕووحییەکەی.

هونەرمەندەکە لە بەرانبەر پیاوەکە دانیشت و دەستی بە دروستکردنی وێنەکەی لەسەر شێوەی ڕووخساری ئەو کرد. ڕۆژێکیان هونەرمەندەکە سەرنجی (شەیتانەکە)ی بەردەمی دا، تێبینیی کرد فرمێسکێك بەسەر

ڕوومەتی پیاوەکەدا دێتە خوارێ، سەری سوڕما و پرسیاری لێ کرد کە ئەگەر پێویستی بە جگەرە هەیە، یان بە پێکێك مەی، بۆی بهێنێت، بەڵام پیاوەکە وەڵامی دایەوە –کە قسەکانی زیاتر لە گریان دەچوون لەوەی کە قسە بێت–: گەورەم تۆ پێش زیاتر لە بیست ساڵ سەردانت کردم، کە منداڵێکی بچووك بووم و وێنەی فریشتەیەکت لەسەر شێوەی ڕووخساری من دروست کرد، ئەمڕۆیش هەر لەسەر شێوەی ڕووخساری من وێنەی شەیتان دروست دەکەیت و ئیلهامی لێ وەردەگری. ڕۆژگار و شەو و ڕۆژەکان حاڵی منیان گۆڕی تا بوومە پێچەوانەو خۆم. ئەوەی گوت و فرمێسکی چاوەکانی هاتنە خوارێ و باوەشی بە هونەرمەندەکەدا کرد، هونەرمەندەکەیش فرمێسکی چاوەکانی هاتنە خوارێ، پێکەوە بەرانبەر وێنەی فریشتەکەدا نیشتن و تێر گریان".

محەممەد عالی دەلێ: "کاتێك ئەو چیرۆکەم خوێندەوە، بوو بە پەند و ئامۆژگارییەکی گەورە بۆم، بیرم لە بوونەوەر و ژیان کردەوە و ئیتر بە تەواوی گۆڕام، هەرچەندە من ڕۆژێك لە ڕۆژان شەیتان نەبووم، تەنیا ئەوە نەبێ ژیانێکی پڕ لە هەڵە و تاوانی گەنجیم بەسەردەبرد". هەرچەندە چیرۆکەکە ڕۆژئاواییە، بەڵام یارمەتیی دام وەکو موسڵمانێك بۆ جێگیربوونی باوەڕ لەناو دڵمدا، چوونکە دەرەنجام ئاماژە و بەڵگەیە لەسەر توانای خوای گەورە لەسەر گۆڕینی مرۆڤەکان، ئەگەر پابەند نەبن بە ڕێنماییەکانی ئایین و ڕێز لە سنووری شەرع نەگرن".[١٧] مەبەست لەو چیرۆکە، ڕوونکردنەوەی کاریگەریی هونەرە لەسەر هەڵویستی مرۆڤەکان. حوکمی شەرعیی هونەرە دەستییەکان لەم خاڵانەی خوارەوەدا ڕووندەکەینەوە:

---

[١٧] الفن المعاصر، لا: ٣٨.

## وێنەکێشان

وێنەکێشانی گشت شتێك دروستە، جگە لە گیانلەبەر، وەکو دیمەنـەکانی سروشت و سەوزایی و چیا و دار و بەرد و...هتد. هەر وەکو ئیمامی نـەوەوی دەفەرموێ: "دروستکردنی وێنەی درەخت و هاوشێوەکانی، هەروەها کردنی بە پیشە، دروستە و حەرام نییە".[18]

هەروەها ئەگـەر وێنەکێـشانی گیانلەبـەریش بـێ، بـە مـەرجێك وێنەیـەکی تەواو نەبێ، وەکو: بەشی سەرەوەی مرۆڤ، یان ڕووی، هـەر وەکـو پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی: ((الاّ رقمـاً مـن ثـوب))[19] وشـەی (رقـم) هەنـدێ فـەرموودەناس دەڵـێن: واتـە بەشـێکی وێنـەی گیانلەبـەرێك ئەگـەر لەسـەر جلوبەرگێك بوو، یان لەسـەر پارچـە قوماشـێك، بەشـێکی دیکـە پێیـان وایـە مەبەست لە (رقم) وێنەی گیانلەبەر نەبێ.

هەروەها وێنەی تەواوی گیانلەبەر دروستە، ئەگەر لەسەر زەوی بوو، یـان لـە ڕایـەخێك کـە خـەڵکی بەسـەریدا دەڕۆن، هـەروەها ئەگـەر وێنـەی گیانلەبەرەکە سـەری لـێ کرابـووەوە، هـەر وەکـو لـە فـەرمودەی پێغەمبـەر (ﷺ) هـاتووە: ((استـأذن جبريـل عليـه الـسلام علـى الـنبي ﷺ فقـال: ادخل، فقال: كيف ادخل و في بيتك ستر فيه تصاوير؟ فاما أن تقطـع رؤسـها أو تجعل بساطاً يوطأ فانّا معشر الملائكة لا ندخل بيتاً فيه تصاوير))[20]

واتـە: جبریـل سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت داوای هاتنـە ژوورەوەی لـە پێغەمبەر (ﷺ) کرد، پێغەمبەریش فەرمووی وەرە ژوورەوە، بەڵام جبريل

---

[18] شرح صحيح مسلم، بەرگی: ١٤، لا: ٧٧.

[19] صحيح البخاري، بەرگی: ١٠، لا: ٤٧٨، ژمارەی فەرموودە: ٥٩٥٨، صحيح مسلم مع شرح النـووي، بـەرگی: ١٤، لا: ٧٢، ژمارەی فەرموودە: ٢١٠٦.

[20] سنن النسائي، لا: ٨٤٩، ژمارەی فەرموودە: ٥٣٧٥.

فەرمووی: چۆن بێمە ژوورەوە کە لەماڵەکەتدا پەردەیەك هەیە وێنەی لەسەر کێشراوە؟ یان سەری وێنەکە دەبڕی، یان دەیکەیتە ڕایەخێك کە پێی لەسەر دادەنرێ، چوونکە ئێمەی فریشتەکان ناچینە ماڵێك کە وێنەی تێدا بێت. بەڵام وێنەکێشانی تەواوی گیانلەبەر (مرۆڤ بێت یان ئاژەڵ) نەهیی لێکراوە، مەبەستەکەی لاساییکردنەوەی دروستکراوەکانی خوا بێت، یان تەنیا بۆ جوانی و هەڵواسین بێت لە ماڵەکاندا، هەرچەندە حوکمی حەرامییەکەی یەکدەنگیی زانایانی لەسەر نییە. نەهییەکەش لەم فەرموودانەدا هاتووە:

١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ أَبِى طَلْحَةَ عَنِ النَّبِىِّ (ﷺ) قَالَ: ((لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلاَ صُورَةٌ))[21]، واتە: فریشتەکان ناچنە ماڵێك کە سەگ، یان وێنە و نیگاری تێدا بێت.

٢- عن عائشة رضي الله عنها: قدم رسول الله (ﷺ) من سفر وقد سترت بقراملي على سهوة[22] لي فيها تماثيل فلما رآه رسول الله ﷺ هتكه، وقال: ((أشد الناس عذابا يوم القيامة الذين يضاهون بخلق الله))، قالت فجعلناه وسادة أو وسادتين، واتە: عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە: ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ لە سەفەر گەڕایەوە، منیش دەلاقەکەم (سهوە) بە پەردەیەك داپۆشیبوو کە وێنەی لەسەربوو، کە پێغەمبەر (ﷺ) بینیی، پەردەکەی لادا و فەرمووی: "ئەو کەسانەی بۆ لاساییکردنەوەی دروستکراوەکانی خوا وێنە دەکێشن، لە

---

[21] صحيح البخاري، بەرگی: ٣، لا: ١١٧٩، ژمارەی فەرمووده: ٣٠٥٣، صحيح مسلم، بەرگی: ٦، لا: ١٥٦، ژمارەی فەرمووده: ٥٦٣٦.

[22] **سهوة**: بریتییە لە ژوورێکی بچووك وەکو کۆگا، یان دەلاقەیەك شتی لەناو دادەنرێت، بڕوانە: النهاية ابن الأثير، بەرگی: ١، لا: ٨٣١.

ڕۆژی دواییدا ئازاریان لە هەموو خەڵکی زیاترە". عائیشە رضي الله عنها دەفەرمووێ: پەردەکەم کردە یەك دوو سەرین[٢٣].

بەڵام حوکمی نەهییەکە لە نێوان حەرامی و ناپەسندیدایە (کراهە)، بە بەڵگەی ئەم فەرمودەیە: عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ كَانَ لَنَا سِتْرٌ فِيهِتِمْثَالُ الطَّائِرِ وَكَانَ الدَّاخِلُ إِذَا دَخَلَ اسْتَقْبَلَهُ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم:((حَوِّلِي هَذَا فَإِنِّي كُلَّمَا دَخَلْتُ فَرَأَيْتُهُ ذَكَرْتُ الدُّنْيَا)) چوونکە عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە کە پەردەیەکی هەبوو وێنەی باڵندەیەکی لەسەر بوو، کەسێك هاتبایە ژووری، ڕووبەڕووی دەبووەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەو پەردەیە وەرگێڕە، چوونکە هەر کاتێك دێمە ژوورەوە و چاوم پێی دەکەوێ، دونیام دێتەوە یاد[٢٤].

## تاشینی وێنە و هەڵکەندنی ( نحت )

تاشینی وێنە و هەڵکەندنی، ئەگەر پەیکەر نەبێت و لەسەر تەخت بێ، وەکو نیگارکێشان وایە، لەسەر گشت ماددەکانیش دروستە، مەگەر زێڕ و زیوو بێ و بۆ جوانی بێت، ئەوە دروست نییە. پەیکەریش ئەگەر پەیکەری گیانلەبەر بێ، بە کۆی دەنگی زانایان دروست نییە، بەڵام ئەگەر پەیکەری گیانلەبەر نەبێت، دروستە.

هەندێ لە زانایانی سەردەم وەکو: شیخ محەممەد عەبدە، پێیان وایە هۆکاری (علـة) حەرامیی پەیکەرتاشین، لەبەر ئەوە بووە کە خەڵك پەرستویەتی، بەڵام ئەو واقیعە لە ئێستادا گۆڕاوە. لیژنەی ئەزهەر ئەم ڕایەی لەلا پەسند نەبوو و قەبووڵی نەکرد، بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەو فەرموودەیە بە هاوەڵەکان گوتراوە، لەگەڵ ئەوەی لای هەموو کەسێك زانراوە کە

[٢٣] صحيح البخاري، بەرگی:٥ لا: ٢٢٢١، ژمارەی فەرموودە: ٥٦١٠.

[٢٤] صحيح مسلم، بەرگی:٦ لا: ١٥٨، ژمارەی فەرموودە: ٥٦٤٣.

باوەڕیـان بـەهێز بـووە، بـەڵام حـەرام كردنەكـە بـۆ پاراسـتنی بـاوەڕ و یەكتاپەرستی بووە.[25]

(شیخ یوسف ئەلقەرزاوی) زیاتر ئەو لایەنە ڕووندەكاتـەوە و دەڵـێ: "تـا ئێستاش لەم سەردەمەی ئێمەدا، كەسانێك هـەن بـت و پەیكـەر دەپەرسـتن، یان چێل و گا دەپەرستن، كە وابێ بۆ نكووڵی لـە واقیـع بكـەین؟ خـەڵكی لەم سەردەمەشدا باوەڕیان بە ئەفسانەكان هەیـە، عـەقڵی مـرۆڤیش هەنـدێ جار قەبووڵی هەندێ شت دەكات كە جێی سەرسوڕمانە، هەتا ڕۆشـنبیرەكان دەكەونە نـاو هەنـدێ بیروبـاوەڕ كـە پووچـەڵترین بـاوەڕە، بۆیـە هـەر شـتێك سەربكێشێ بۆ بتپەرستی، ئیسلام حەرامی كردووە".[26]

(شێخ عەبـدوللا ئـیبن بییـە) بۆچـوونی وایـە كـە وێنـەی پەیكـەری تـەواو دروستە، حەرامییەكەی لەبەر لاسـاییكردنەوەی خـەلقی خـوا بـووە و دەڵـێ: "ئەوەی ئەو مەبەسـتە زیـاتر ڕووندەكاتـەوە، جیاكردنـەوەی وێنەیـە لەسـەر جلوبەرگ، یان لەسـەر زەوی و ڕایـەخ و ژێـر پـێ، یـان ئـەو پەیكەرانـەی بـۆ ڕاهێنانی منداڵان لەسـەر پـەروەردەكردن، كـە ئەوانـە دروسـتن هـەر چـەندە پەیكـەری تـەواویش بـن، ئەوانـە بەڵگـەن لەسـەر ڕەچـاوكردنی مەبەسـت لـە حەرامی یان دروسـتی. هـەروەها دروسـتیی پەیكەرتاشـی بـۆ پێغەمبـەر داود ﷺ و باسكردنی لە قورئانـدا، ئەوانـە هـەموو بەڵگـەن لەسـەر ڕەچـاوكردنی مەبەستی پەیكەرتاشی و ڕۆڵی لە دروستی یان نادروستیدا".[27]

---

[25] گۆڤاری(الأزهر)ژمارەی مانگی رجب،ساڵی ١٣٧٠ك.

[26] فتاوى معاصرة، د يوسف القرضاوي، بەرگی یەكەم، لا ٦٩٧.

[27] الفن المعاصر، لا: ٣٢.

بەڵام ئەوەی پێغەمبەر داود و سولەیمان ﷺ شەرعی میللەتانی پێشووە و نابێتە شەرع بۆ ئێمە، بە تایبەتی ئەگەر بەڵگە لە شەرعی ئێمە هەبوو، کە شەرع نییە بۆ ئێمە و دروست نییە، لەم بارەدا بە کۆی دەنگی زانایانی (اصول الفقه) نابێتە شەرع بۆ ئێمە و دروست نییە پەیڕەوی بکەین.

جگە لەوەی پەیکەرتاشیی گیانلەبەران جوانی فەراهەم نایەنێت، چوونکە مرۆڤ ناتوانێت لاسایی خەلقی خوا بکاتەوە، بۆیە هونەری ئیسلامی خۆی لە وێنەکردنی ڕەهەندی سێیەم دوور گرتووە. لێرەدا پێویستە بنەما و ئاراستەکانی هونەری وێنەکێشان لە ئیسلامدا ڕوونبکەینەوە، هەندێ توێژەر پێیان وایە ئەو بنەمایانەی هونەری ئیسلامی کۆدەکاتەوە، ئەمانەن:

١- دوورکەوتنەوە لە وێنەکردنی مرۆڤ و گیانلەبەران.

٢- ڕەتکردنەوەی ئەو بنەمایەی هونەری یۆنانی لەسەر دامەزراوە، کە بریتییە لە لاساییکردنەوە (المحاكاة) لەبەر ئەوەی موسڵمانان خۆیانیان بەدوور گرتووە لە لاساییکردنەوەی مرۆڤ و گیانلەبەران لەسەر بنەمای پێچوواندن (تشبیە) بە خوای گەورە کە خەلق و دروستکراو تەنیا بۆ ئەوە، لەجیاتی ئەوە موسڵمانان فۆڕم و ڕەنگیان لە بوونەوەر و سروشت هەڵێنجاوە، پاشان دەوڵەمەندیان کردووە بە ڕەگەز و جۆرایەتی (التنوع).

٣- دوورکەوتنەوە لە جێهێشتنی بۆشایی لە وێنەکردندا، چوونکە ئاماژەیە بۆ نەبوون (العدم) نەبوونیش لە هزری ئیسلامیدا مانای نییە، چوونکە لەناوچوونیش لە هزری ئیسلامیدا دەستپێکی ژیانێکی دیکەیە کە بەرزتر و پڕخێرترە لەم ژیانە.

٤- دوورکەوتنەوە لە ڕەخساندن و بەکارهێنانی یەکڕەگەزی (عنصر واحد)، یان یەکڕەنگی، یان یەکفۆڕمی، چوونکە دەبێتە ئاماژەیەك بۆ

یەکایەتی (الوحدة) و بەردەوامی، کە واتای نەمری دەگەیەنن، ئەو کارەش تەنیا بۆ خوایە (سبحانە)، ئەو بنەمایەش وای کردووە وێنەکان دەوڵەمەند بن بە چەندان جۆر ڕەگەز و پێکهاتە. هەروەها ڕەتکردنەوەی تەنیا نموونەیەك، چوونکە نموونە واتای تەواویی دەگەینێت، تەواوییش تەنیا بۆ خودایە.[28]

## هونەری شێوەکاری

هونەری شێوەکاری (نیگارکێشان بێت یان پەیکەرتاشی) لە ڕاستیدا وێنەکێشانێکی هێماییە، یان ناهێمایی، دەرەنجام حوکمەکەی بۆ ئەو وێنە دەگەڕێتەوە کە لێی بەدی دەکرێ. لە هونەری شێوەکاریدا، ئەگەر وێنەی تەواوی گیانلەبەرانی لەخۆ نەگرتبێت، ئەوە دروست دەبێت، وەکو وێنەی بەشەکان و ئەندامەکانی مرۆڤ و گیانلەبەران، کە کەرەستەیەکی سەرەکین بۆ هونەری شێوەکاری، وەکو: وێنەی دەست یان چاو یان هەنگاوی مرۆڤ، جگە لەو ڕێبازە هونەرییانەی کە وێنەی تەواوی گیانلەبەرانی تێدا بەکار نایەت، وەکو ڕێبازی (تەجریدی و تەکعیبی و تەعبیری و سووریالی)، چوونکە کەرەستە و پێکهاتەی ئەم ڕێبازانە هێمایین نەك وێنەی تەواو ڕاستەقینە. هەروەها هونەری خۆشنووسی یەکێکە لە بابەت و ڕەگەزەکانی هونەری شێوەکاری.[29]

---

[28]فن التصوير بين التشريع الاسلامي و الابداع الحضاري، لا: ١٧٦.

[29]الفن المعاصر، لا: ٣١.

## فیلمە کارتۆنییەکان

وێنەی فیلمە کارتۆنییەکان بە دەست بێ یان بە کۆمپیوتەر، هەندێ لە زانایان وەکو وێنەی ئاسایی هەژماری دەکەن، بەڵام زۆرێك لە زانایانی سەردەم بە دروستی دەزانن لەسەر سێ بنەما:

یەکەم: قیاس کردن لەسەر بووکەشووشەکان، کە دروستە منداڵان یاریی پێ بکەن، یەکسانکردنی حوکمەکەی بەوان و بە یارییە پەیکەرییەکان، کە لە فەرموودەی عائیشەدا هاتووە ﵁ ((أنها كانت تلعب بالبنات، فكان النبي (ﷺ) يأتي بصواحبي يلعبن معي))[٣٠]، کە هەندێ بووکەشووشەی هەبوو و یاریی پێ دەکردن، پێغەمبەریش (ﷺ) هاوڕێکانی بۆ دەهێنام تا یاریم لەگەڵدا بکەن. ئەو ڕێپێدانە بەو جۆرە یارییانە، گشتییە بۆ منداڵان، کوڕ بێ یان کچ، مەبەستەکەشی فێرکردنی منداڵان و دڵخۆشکردنیانە.

دووەم: فیلمە کارتۆنییەکان پێویستییەکی سەردەمییانەن بۆ پەروەردەکردنی منداڵان و ئاراستەکردنیان بۆ کاری چاك و بنیاتنەر.

سێیەم: وێنەی کارتۆنی، وێنەی ڕاستیی مرۆڤ و گیانلەبەران نین و هاوتا نین لەگەڵ ڕاستیی شێوەیان، بۆیە ناچێتە چوارچێوەی نەهیکردن لە نیگارکێشانی گیانلەبەران.[٣١]

---

[٣٠] مسند أحمد بن حنبل، بەرگی: ٤٣، لا: ١١٥، ژمارەی فەرموودە: ٢٥٩٦١، و قال محققه: اسناده صحيح على شرط الشيخين.

[٣١] بين الفن و الفقه، لا: ١٤٤.

## سوودی فیلمە كارتۆنییەكان بۆ منداڵان

١- بە شێوەیەكی سادە و ئاسان زانیارییەكی زۆر بە منداڵان دەدات، هەندێك فیلمی كارتۆنی تیشك دەخاتە سەر ناوچەیەكی جوگرافی، هەندێكی تر زانیاریی زانستی دەدات، وەكو: كاری كۆئەندامەكانی مرۆڤ، چەندان زانیاریی دیكەی بەسوود كە منداڵ زانیارییەكی زۆری بەدەست دەكەوێت لە قۆناغێكی زووی تەمەنیدا.

٢- گەشەپێدانی خەیاڵی منداڵ و پەرەپێدانی تواناكانی، ئەوەش یارمەتیی دەدات لەسەر داهێنان و نوێكاری و بیركردنەوە.

٣- فێركردنی زمانێكی پاراو كە زۆر جار لە ماڵ و ژینگەی خۆی گوێی لێی نابێت، زانراویشە كە فێربوونی زمانی پاراو و ڕاست و دروست، یەكێكە لە مەبەستەكانی پەروەردە و فێركردن.

٤- پەروەردكردنی منداڵ لەسەر ڕەفتار و ئادابی جوان، وەكو: بەزەیی و خۆشەویستی و چاكە لەگەڵ دایك و باوك و هەوڵدان بۆ سەركەوتن...هتد.

فیلم و دراما كارتۆنییەكان ئەگەر بابەتی دروست بخەنە ڕوو و بەپێی ڕێساكانی شەرع بە پشتبەستن بە ڕای كۆمەڵێك لە زانایان كە پێیان وایە وێنەی فۆتۆگراف بۆ پێویستی دروستە، وە بە ڕەچاوكردنی واقیع، وا دەبینین كە دۆزینەوەی جێگرەوەی ئەو جۆرە هونەرانە كە ئاراستەكراو بێت بۆ مەبەستە شەرعییەكان و بتوانێت ڕكابەری بكات لە جیهانێك كە خێزان و منداڵ بوونەتە قوتابیی شاشەكانی تەلەفیزیون و فیلمە ڤیدیۆییەكان و لاپەڕەكانی ئینتەرنێت... هتد، پێویستییەكی گرنگە و بەرژەوەندییەكی بەهێزە، لەبەر ئەم هۆكارانەی خوارەوە:

١- بڵاوبوونـەوە و تەشـەنەکردنی فیلمـەکان لـەناو کۆمـەڵگادا بـە گـشت جۆرەکانیەوە و لەناو گشت توێژەکانی کۆمـەڵگا، زانراویـشە زۆربـەی لەگـەڵ ئادابی ئیسلام ناگونجێت، جێهێشتنی ئەو خەڵکەش تا ببنە نێچیرێك بـۆ ئـەو جۆرە هونەرە ڕووخێنەرانە، کارێکی دانایی نییە و دیـدێکی ڕاسـت نییـە، بـە تایبەتی کە هەنـدێ جـۆری نوانـدن جیاکراونەتـەوە لـە حـەرامی، وەکـو: بـۆ فێرکردن و بەڵگەدارکردنی بابەتە پێویستەکان.

٢- دەستەوەستانیی موسڵمانان بەرانبەر ئەو فیلم و درامایانە، تـا گاڵتـە بـە عـەقڵ و هەسـتی موسـڵمانان بکـەن و بیروبـاوەڕ و ڕەوشـتی پووچـەڵ بڵاوبکەنـەوە، تـەنیا ڕەخنـەگرتن و لۆمـەکردنی و ترسـاندنیان بـە سـزا و ئاسەواری خراپ - ئەگەر ئەمانەش پێویست بـن و کاریگـەریی سـنووردارییان هەبێت- چارەسەری ئەو بارودۆخە ناکـات، بـەڵکوو پێویـستە کـاری ئیجـابی بکرێت و ڕووبەڕووی ناحەق ببینـەوە بەهـەمان ئـەو چـەکەی بـەکاری دێـنن، جێگرەوەی ئەو هونەرە ڕووخێنەرانە بەرهەم بهێنین، ئەگەر وا نەکەین، ئەوە ڕەچاوی ڕێسکانی شەرع و مەبەستەکانیمان نەکردووە.

٣- ئەگەر هەندێك تێبینییش لەسەر بەرهەمهێنانی فیلم و درامـای پابەنـد بـە سـنووری شـەرع هـەبێت، بـەڵام بێگومـان بەشـداری دەکـات لـە کەمکردنـەوەی خراپییـەکانی فـیلم و درامـا ناشـەرعییەکان، کـە کـەس ناتوانێـت نکـووڵی لـەو ڕاستییە بکات، کەمکردنەوەی زیان و خراپەش کارێکی ڕەچاوکراوە لە شـەرعدا، هـەر ئـەوەش واتـای ئـەو ڕێسا شـەرعییەیە کـە گـشت زانایـان کـۆکن لەسـەری: "لادان و ڕەتکردنـەوەی گـەورەترینی دوو خراپـە کـە ناتوانرێـت لـە هـەردووکی پـارێزراوبین، مەبەسـتێکی شـەرعییە". شـەرع هـاتووە بـۆ بەدەسـتهێنانی بەرژەوەندییەکان و تەواوکردن و لادانی خراپەکان و کەمکردنەوەیان.

٤– ئەو فیلمانەی پابەندن بە ڕێسا شەرعییەکان، ئامانج و مەبەستی چاك و بەرز بەدەست دێنن، وەکو فێرکردن و ڕاستکردنەوەی چەمکە هەڵەکان و باسکردنی ڕووداوەکانی مێژوو و دەرخستنی کەسایەتییە بەرزەکانی ئیسلام... هتد، لە سەردەمێکداکە سەرمەشق و پێشەنگی گەنجان بووەتە گۆرانیبێژ و ئەکتەر و یاریزانەکان، هاوشێوەی ئەو بابەتانە کاریگەریی باشیان لەسەر بینەران بە گشتی و هەرزەکاران و گەنجان بە تایبەتی دەبێت.

٥– پێویستە جێگرەوەیەکی شەرعی دابنرێت بۆ ئەو کەسانەی کار لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن دەکەن، یان بۆ خاوەن شوێنەکانی بازرگانیی فیلمە ڤیدیۆییەکان و بۆ ئەوانەی بەکارهێنەر و بینەرن، هەر وەکو پێویستە هەڵوێستمان وەکو هەڵوێستی پزیشك بێت، کە ڕێ لە هۆکارەکانی نەخۆشی بگرین و هۆکارەکانی لەناوچوون و خراپەکاری بەپێی توانا لەناو ببەین.[٣٢]

## هونەری کاریکاتێر

هەندێ زانا، هونەری کاریکاتێر بە دروست دادەنێن، لەسەر ئەو بنەمایەی وێنەی ڕاستی مرۆڤ نین، وەکو وێنەکردنی چاوێکی گەورە، یان لووتێکی گەورە کە لە وێنەی ڕاستییەوە دوورە، یان چەند وێنەیەکی تێکەڵکێشکراون و هێمایین، بەم واتایەش دروست دەبێ، چوونکە وێنەی ڕاستی نین و مەبەستەکەی لاساییکردنەوەی ڕاستی نییە، بەڵکوو نیشاندانی دیاردەیەك و زەقکردنەوەیەتی، جگە لەوەی ڕەهەندێکی دەروونیی هەیە، کە دڵخۆشییەك دەداتە بینەری و (تنفیس)ێکە لە کاتی قەیرانەکان.[٣٣]

---

[٣٢] حكم احتراف و بيع الافلام الكارتونية و التمثيل، سایتی: www.islamweb.net.

[٣٣] الفن المعاصر، لا: ٣٠.

## وێنەی فۆتۆگرافی

وێنەی فۆتۆگرافی لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا داهێنراوە. و شەی فۆتۆگراف واتە: نووسین بەتیشك. وێنەی فۆتۆگرافی لە ڕێگای زووم و خویّ و تیشکەوە دەگیریّ.[٣٤]

وێنەی فۆتۆگۆافی لەم سەردەمەدا زۆر بڵاوە و کاریگەریی لەسەر زۆرینەی بوارەکانی ژیان هەیە. ئەگەر وێنەی فۆتۆگرافی، وێنەی ناشەرعی بێت، وەکو وێنەی ئافرەت بەشێوەیەکی نەشیاو، یان بۆ کاری ناشەرعی و تاوان بەکاربێت، ئەوە گومانی تێدا نییە کە حەرامە. ئەگەر وێنەی گیانلەبەران نەبێت، وەکو وێنەی دیمەنەکانی سروشت و بوونەوەر، ئەوە بە کۆی دەنگی زانایان دروستە. ئەگەریش وێنەی مرۆڤ و گیانلەبەران بێت و خراپ بەکاربهێنرێت، ئەوە زانایان دوو ڕایان هەیە:

١- لای زۆرێك لە زانایان دروستە، وەکو: موحەمەد بەخیت ئەلمتیعی ، شێخ سەید سابق، شێخ موحەمەد صالّح ئەلعوسەیمین، دکتور یوسف ئەلقەرزاوی، وزانایانی لیژنەی فەتوای ئەزهەر.

٢– لای بەشێکی دیکەش حەرامە، وەکو: شێخ ئیبن باز، شێخ صالح ئەلفۆزان، زانایانی لیژنەی فەتوای سعودیە.[٣٥]

بەڵگەی ئەوانەی پێیان وایە دروستە:

١– بەشێکیان ئەوانەن کە پێیان وایە تەنیا وێنەی پەیکەری (مجسم) حەرامە، کە وابێت هەمان بەڵگەی دروستی وێنەکێشان دێننەوە بۆ دروستیی وێنەی فۆتۆگرافی.

---

[٣٤] ممارسة الفن، لا: ٣٤٧.

[٣٥] ممارسة الفن، لا: ٣٤٩.

٢- ڕێسای (الأصل في الأشياء الاباحة)، کار و دروستکراوەکان لە بنەڕەتدا دروستن، مەگەر بەڵگەی شەرعی هەبێت لەو ڕێسا گشتییە جیایان بکاتەوە، کە وابێت وێنەی فۆتۆگرافییش دروستە.

٣- هۆکاری حەرامیی وێنەی تێدا نییە، کە لاساییکردنەوەی دروستکراوەکانی خوایەو لە فەرموودەکانی نەهیکردن لە وێنەکردندا هاتووە.

٤- پێناسەی وێنەگرتنی بەسەردا جێبەجێ نابێت، چوونکە وێنەگرتن پەیداکردنی وێنەیەکە کە بوونی نەبێت، بەڵام وێنەی فۆتۆگرافی بە کامێرای سەردەم، بەندکردنی وێنەی شتێکە، یان مرۆڤێك کە بوونی هەیە (موجودە) وەکو ئاوێنەیە، ئەو فەرموودانەشکە پەیوەندییان بە وێنەکێشانەوە هەیە، مەبەست لێیان ئەو جۆرە وێنانەیە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بوونیان هەبووە.

٥- ئەو جۆرە هونەرە سوودێکی زۆری و بۆ پاراستنی زمان و زانست و هونەر و کارە سەربازی و سیاسییەکان هەیە، لەو سوودانە:

أ- لە کتێبەکانی زماندا ناوی زۆرێك لە ڕووەك و ئاژەڵ و شتی دیکە تۆمار کراون، بە شێوەیەك ڕوونکراوەتەوە کە بناسرێن، ئەگەر بەرانبەر هەر ڕووەك و گیانلەبەرێك وێنەکەی بکرێت، ئەوە دەناسرێن و باشتر خەڵکی مانای و شەکە دەزانن.

ب- ئەگەر جۆری ئاژەڵەکان نەناسرێن، ئەوە زۆرێك لە حوکمە شەرعییەکان نازانرێن، وەکو: ئەو ئاژەڵانەی گۆشتیان حەڵاڵە و ئەوانەی حەرامن، یان حوکمەکانی سزای ڕاوکردن.

ج- سوودی زۆری هەیە بۆ کاری سەربازی، وەکو: زانینی شـوێنی دوژمـن و ڕێگاکـان و شـارەکان و ئەنـدازەی چـەك و... هتـد. هـەروها وێنـەگرتنی گومانلێکراوەکان و سیخورەکان بۆ ناسینەوەیان.

د- بـەکارهێنانی بـۆ نیـشاندان و بڵاوکردنـەوەی بـارودۆخی موسـڵمانان، هەروەها بۆ کـاری بـانگخوازی. بەڵگـەی ئەوانـەی پێیـان وایـە حەرامـە، ئـەو بەڵگانەیە کە بە گشتی وێنەکێشان حەرام دەکەن، بەڵام وەڵامیان دەدرێتەوە بەوەی کە مەبەست لەو فەرمودانە، هەنـدێك جـۆری وێنەکێـشانە، بـە چـەند بەڵگەیەك یدیکەی وەکو جیاکردنەوەی وێنەی هەر شتێك گیانلەبەر نەبێت.[٣٦]

## وێنەی ڤیدیۆ

کرداری وێنەگرتن بە ڤیدیۆ، وەکو کرداری وێنەگرتنی فۆتۆگرافییە، تەنیا ئەوە نەبێت وێنە لە ڤیدیۆدا جووڵەی تێدایە و چەند گۆڕانکارییەکی لە ماددە کیمیاوییەکاندا تێدا زیاد دەکری. ئەوانەی پێیان وایە دروستە، دوو گرووپن: یەکەمیان ئەوانەن کە پێیان وایـە ئـەو وێنانـەی سـێبەریان نییـە، دروسـتن و تەنیا وێنەی پەیکـەری (مجسم) حەرامـە. دووەمیـان ئەوانەنکـە پێیـان وایـە وێنەی فۆتۆگراف دروستە، هەمان ئەو بەڵگانەش دێننەوە بۆ دروستیی وێنەی ڤیدیۆ. ئەوانەیشی کـە پێیـان وایـە حەرامـە، ئەوانـەن کـە گشت جۆرەکـانی وێنەی گیانلەبەران حـەرام دەکـەن، وەکـو لیژنـەی بـەردەوامی فـەتوادان لـە سعودیە.

---

[٣٦] ممارسة الفن، لا: ٣٥٤.

بەشێکیش وێنەی ڤیدیۆ حەڵاڵ دەکەن، بەڵام وێنەی فۆتۆگرافی حەرام دەکەن، ئەو جیاکردنەوەیان هۆکارێك و بەڵگەیەکی دروستی نییە.

لە سوودەکانی وێنەی ڤیدیۆ:

١- موسڵمانان چۆنیەتی نوێژکردن و حەج کردن و ئەرکە شەرعییەکانی لێوە فێر دەکرێن.

٢- فێرکردنی هەندێك پیشە و پیشەسازی و زانستە بەسوودەکان.

٣- کاری بانگخوازی و پەروەردەکردن.[٣٧]

## هونەری خۆشنووسی

هونەری خۆشنووسی، لە هونەرە ئیسلامییە جوانەکانە، کە بە درێژایی مێژوو موسڵمانان گرنگییان پێ داوە.

ئەوەی کە دروست نییە لەو جۆرە هونەرەدا، نووسینی ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرە ﷺ بەشێوەیەك کە لایەقی ئەو دەقە پیرۆزانە نەبێت، وەکو نووسینی لەسەر شێوەی باڵندەیەك، یان کەشتییەك، یان بە شێوەیەکی ئاڵۆز کە تەنیا لە دوای هەوڵدان و ماندووبوونێکی زۆر نەبێ، نەخوێندرێتەوە.[٣٨]

---

[٣٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا: ٣٦٦.

[٣٨] الفن المعاصر، لا: ٤١.

## زەخرەفە

زەخرەفــە، ئــەو نەقــشەیە کــە لەســەر ڕووبــەرێك دروســت دەکرێــت، بەمەبەستی ڕازاندنەوە و جوانکردن. ڕەگەزەکانی ئەو هونەرە بریتین لە:

١- نــەخش: گــشت جۆرەکــانی هەڵکەنــدن و وێنــە و نووســینی نەخــشی دەگرێتەوە.

٢- ڕووبەر: ئەو تەنــەی کــاری نەخــشی لەســەر دەکــرێ، وەکــو: پــەڕاو و تەختە و بینا و... هتد.

٣- مەبەستی ڕازاندنەوە و جوانکردن: لێرەدا مەبەستی زەخرەفەمان بـۆ دەردەکەوێت کە ڕازاندنەوە و جوانکردنی ڕووبەرەکانە بە نەخشێك کە جووڵە و واتای لێ بەدی بکرێ و چێژ لە بینینی وەربگیردرێت.[٣٩]

زەخرەفە لەو ڕووەوەی وێنە و نیگارە، حوکمی وێنە وەردەگرێت، ئەگەر نەخــشەکە وێنــەی گیانلەبــەر نــەبێت، ئــەوە دروســتە وەکــو: شــێوە ئەندازەییــەکانی چوارگۆشــە و سێگۆشــە و بازنــەیی، هــەروەها وێنــەی لـق و گەڵای درەخت و ڕووەکەکان، هەر شێوەیەکی دیکە بێت کە وێنەی گیانلەبەر نەبێت و دروشمێکی تایبەت نــەبێت بــە بێبــاوەڕان و تاوانبــاران، ئــەوەش بــە بەڵگەی گشتیی دروستیی گشت وێنەیەك جگە لــە گیانلەبــەران نــەبێت، هــەر وەکو لە فەرموودەی ابن عباسرضي الله عنه هاتووە: ((ان أبيت الاّ تصنع فعليك بهذا الشجر، كل شيء ليس فيه روح))[٤٠].

زەخرەفە لەو ڕووەوەی ڕازاندنەوە و جوانکارییە، دروستە، بەو بەڵگانــەی جوانکاری و (زينه) حەڵاڵ دەکەن.

---

[٣٩] ممارسة الفن، لا: ٣٦٩.

[٤٠] صحيح البخاري مع شرحه فتح الباري، ژمارەی فەرموودە: ٢٢٢٥، بەرگی:٤، لا: ٥٢٥، صحيح مسلم مع شرح النـووي، ژمارەی فەرموودە: ٢١١٠، بەرگی: ١٤، لا: ٧٨.

نەخــشاندنی کتێــب و پــەڕاوی بەســوود، یــان زانــستی شــەرعیی لــێ نووسرابێت، یان هەر زانستێکی بەسوود دروستە بۆ هانـدانی خـەڵکی لەسـەر خوێندنەوەو سوود لێ وەرگـرتنی، هـەر وەکـو زانایـان نەخـشاندنی قورئـانی پیرۆز و ڕازاندنەوەی بە زێڕ و زیویان بە دروست داناوە، بەمەبەستی (تعظیم) کردنی قورئان.[41]

دەربارەی نەخشاندنی مزگەوتەکان، زانایان سێ ڕایان هەیە:

١- لە لای زۆربەی زانایانی حەنەفی دروستە، لـە لای هەنـدێ زانـای دیکـە ئەگەر بۆ ڕێزلێنان و ڕاگرتنی هەیبەتی بێـت، دروسـتە و خەرجییەکەشـی لـە ماڵ و سامانی (بیت المال) نەبێت.

٢- هەندێ زانای دیکە پێیان وایە ناپەسندە (مکروه).

٣- بەشێکیش لە زانایان پێیان وایە بیدعەیە و زیادکراوە، وەکو ئیمـامی شاتبی و بەغەوی[42].

کـە وابێـت بـۆ بـەرز ڕاگرتنــی هەیبــەتی مزگـەوت، دروسـتە موسـڵمانان داهێنانی هونەری لە دیزاین و نەخشەی مزگەوتەکانـدا بکـەن، بـە شـێوەیەك ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕی ئیسلامی و بنەماکانی هونەری ئیـسلامی بێـت، بـە مەرجێك کاریگەریی لەسەر پاکیی خواپەرستی نەبێت.

---

[41] ممارسة الفن، لا: ٣٧٢، سایتی: www.islamweb.net.

[42] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا: ٣٧٧.

## هونەری بیناسازی

هونــەری بیناســازی و تەلارســازی، لــەو هونەرانەیــە کــە موســڵمانان بــە درێژایی مێژوو ئەنجامیان داوە و داهێنانیان تێدا کردووە.

حوکمی هونەری بیناسازی، هــەر پێـنج حوکمـە شـەرعییەکانی بەسـەردا جێبەجێ دەبێت، ئـەو کەسـەی توانـای هـەبێت بـە پێـی پێویـست لەسـەری واجیبە، چوونکە دابینکردنی شوێنی نیشتەجێبوون لە خەرجییە واجیبەکانە، هــەروەها بینــاکردنی مزگــەوت بــۆ جێبــەجێکردنی جومعــە و جەماعــەت و دروشمەکانی دیکە.

– بۆ حەواندنەوەی لێقەوماوان و ڕێبواران، سوننەتە و پاداشتی هەیە.

– ئەگەر لە پێویست زیاتر بێت، ناپەسندە (مکروە).

– ئەگـەر بـۆ مەبەسـتی تـاوان و خراپـەبێ، حەرامـە، وەکـو: مەیخانـە و مەلها... هتد.

– ئەگەر بۆ مەبەستی حەڵاڵ بێت، ئەوا حەڵاڵە، وەکو بازرگانی.[٤٣]

کە وابێت بیناسازیی واجیب و سوننەت و حـەڵاڵ، بازنەیـەکی زۆر فراوانـە بـۆ هونـەری بیناسـازی، کـە دەکرێـت موسـڵمانان داهێنـانی تێـدا بکـەن و بنــەماکانی هونــەری ئیــسلامیی تێــدا بدرەوشــێنێتەوە، کــە گوزارشــت لــە بیروبـاوەڕ و دیـدی ئیـسلامی بکـات. لـە مەرجـەکانی گـشت کـارێکیش لـە ئیسلامدا، ڕێکی و جوانیی ئەنجامدانیەتی، ئەوەی دروست نییـە ئەوەیـە کـە زێدەڕۆیی و ئیسراف تێدا بکرێ.

---

[٤٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا: ٣٩٣.

## دووەم: هونەرە بینراوەکان

چەند جۆرە هونەرێك دەگرێتەوە، وەکو: سینەما و شانۆ و دراما و فیلمەکان، بە گشت جۆرەکانیەوە.

ئەم جۆرە هونەرە پشت بە لاساییکردنەوە و گێڕانەوەی ڕووداوێکی واقیعی، یان خەیاڵاوی دەبەستێت، ڕووداوێکی ڕابردوو، یان هەنووکەیی، بە مەبەستی دانانی کاریگەری لەسەر بینەرەکان و گەیاندنی بیرۆکەیەك، یان پەیامێك.

ئەم جۆرە هونەرە کاریگەریی لە گشت هونەرەکانی دیکە زیاترە، چوونکە و شەو جووڵە و دەنگ و وێنە و دەربڕین و ڕووناکی و سێبەر و چەندان ڕەگەزی دیکەکۆدەکاتەوە.

کاریگەریی فیلم و دراما و سینەما لەسەر تاك و کۆمەڵگا، شاراوە نییە، کە دەبینرێ خەڵکی چەند خولیای ئەو هونەرەن، چەند کاتی پێ بەسەر دەبەن، چەند کاریگەریی لەسەر بیرکردنەوە و هەڵسوکەوت و جلوبەرگ و هەست و نەستیان هەیە.

بۆ زانینی کاریگەریی ئەو هونەرە، چەند نموونەیەك دەخەینە ڕوو:

١- یەکێك لە هۆکارەکانی لاوازیی خیلافەتی عوسمانی، هاتنی شانۆ و خەریککردنی خەڵکی بوو بە نمایشەکانی شانۆ.

٢- ئەو کاریگەرییەی زنجیرە تەمسیلی (باب الحارة) لەسەر کۆمەڵگەی عەرەبی و ئیسلامیهەبوو.

٣- کاریگەریی زنجیرە تەمسیلی (اصحاب الكهف) و پێغەمبەر یوسفﷺ.

کە وابێت ڕاستیان گوتووە: هێزی دەسەڵات مرۆڤەکان ئاراستە دەکات، بەڵام هێزی هونەر دەسەڵات ئاراستە دەکات.

چـــەندان بەرنامـــەی هونـــەری هـــەن لەســـەر ئاســـتی جیهـــان، کـــە پێـــشکەشکەرانی ناوبانگیـــان لـــە ناوبـــانگی ســـەرۆکی ئەمـــەریکا زیـــاترە، چەندانکەس ناوی ئەکتەرەکان لە منداڵەکانیان دەنێن.

مەبەست لەو ڕوونکردنەوەیە، پشتگیری نییە لە ناشەرعییەکانی بەرهەمە هونەرییەکان،بـەڵکوو ڕوونکردنـــەوەی کاریگـــەریی هونـــەرە لەســـەر تـــاك و کۆمەڵگا. میللەتان و شارستانیەتەکان هونەر بـۆ بڵاوکردنـەوەی بیروبـاوەڕ و زاڵکردنـی شارسـتانیەتیان بـەکاردێنن، ئەگـەر موسـڵمانانیش ئـەو مەیدانـە جێبهێڵن، ئەوە ئەو (بۆشاییە شارستانییە) بەردەوام دەبێ، چـوونکە کەناڵـە ئاسمانییـــەکان و هونـــەرە نائیـــسلامییەکان، مەیدانەکـــە پڕدەکەنـــەوە و مەبەستەکانیان لە ڕێگەی ئەو هونەرانەوە بەدیدێنن.

## حوکمی هونەری نواندن

ئەو زانایانەی پێیان وایە هونەری نواندن و دراما دروستە –ئەگـەر بـەپێی ڕێسا شەرعییەکان بوو– پشتیان بە چەند بەڵگەیەك بەستووە:

١– لە قورئـانی پـیرۆز و سـوننەتی پێغەمبـەردا، چـەند نموونەیـەك هـەن لەسەر نمایش کردن و نواندن بۆ ڕووداوێکی دیاریکراو، وەکو:

أ– ئەوەی لە چـیرۆکی پێغەمبـەر داود ﷺ هـاتووە لەگـەڵ فریـشتەکان (وَهَلْ أَتَاكَ نَبَأُ الْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا الْمِحْرَابَ، إِذْ دَخَلُوا عَلَى دَاوُودَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ قَالُوا لاَ تَخَفْ خَصْمَانِ بَغَى بَعْضُنَا عَلَى بَعْضٍ فَاحْكُمْ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ و لاَ تُشْطِطْ و اهْدِنَا إِلَى سَوَاءِ الصِّرَاطِ) [ص: ٢١-٢٢] ، واتە: ئایا هەواڵی داواچییەکانت پێگەیشتووە، کاتێك بە دیواری خەڵوەتگاکـەدا سـەرکەوتن، لـەناکاو چـوونە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر داود ﷺ ئەویش داچـڵەکا و ترسـا لێیـان، وتیـان

مەترسە ئێمە دوو داواچین، یەکێکمان ستەمی لەوەی تر کردووە، جا لە نێوانماندا بە حەق و ڕاستی بڕیار بدە و لە ڕاستی لامەدە و ڕێنموویمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست.

ب- چیرۆکی بەڵەك و کەچەڵ و نابینایەکە، کە فریشتەیەك دێتە لایان وەکو پیاوێك خۆی نیشان دەدا، ئەوەش بە مەبەستی ڕێنمایی و فێرکردن.

٢- بابەتی دراما و نواندن و سینەما، لە کارە نویٚ و سەردەمییەکانە، کە پێشتر بەو شێوەیەی ئێستا نەبووە، هەندیٚ لە زانایان پێیان وایە نواندن کاریگەریی زیاترە لە هەزار و تار و بەشداری کردن لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بە تایبەتی لەم سەردەمەدا، واجبێکی شەرعییە.

بڵاوبوونەوەی مەسیحیەت لە هەندیٚ شوێندا، لەبەر ڕاستی و دروستیی بەرنامەکەیان نییە، بەڵکوو لەبەر بەرگریکردنیەتی بە ڕازاندنەوە و هەڵخەڵەتاندن، دواکەوتنی بانگەوازی ئیسلامیش لە هەندیٚ شوێن، بە هۆی کەمتەرخەمییانە لە نیشاندانی ڕاستییەکانی ئیسلام بە بەرگی جوان و شێوازی کاریگەر و نویٚ، بۆیە زۆر جار بەرنامەیەکی هونەری ڕاستییەکان دەگەیەنێت، کە لە ڕێگای وتارێکەوە ئەو بابەتە ئەو کاریگەرییەی نابێت.

٣- مەبەست لە هونەرە بینراوەکان، لاساییکردنەوە و گێڕانەوەی ڕووداوێکی واقیعییە، یان خەیاڵاوی، بۆیە ئەو قسە داڕێژراوانەی لە سیناریۆکەدا هەن، خەیاڵی بن یان واقیعی، بە درۆ دانانرێت، چوونکە هونەرمەندەکان ناسراون، کارەکەیان لاساییکردنەوە و گێڕانەوەیە، خەڵکیش دەزانن کە ڕۆڵی زانایەك دەبینن، یان بازرگانێك، یان پادشایەك.

٤- ئەگەر لاسایی و گێڕانەوە دروست بیٚ بەو بەڵگانەی باسمان کردن، ئەوا لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا دروست نابیٚ:

أ– لاساییکردنەوەی زاتی خوای گەورە: (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ و هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ) [الشوری: ١١] واتە: هیچ شتێك بە وێنەی خوا نییە و ئەو بیسەری بینایە.

ب– نواندنی ڕۆڵی پێغەمبەران دروست نییە، لەبەر ڕێز و پلەی بەرزیان لەلای خوا و کەسیش شیاوی پلە و پایەی ئەوان نییە.

ج– نواندنی ڕۆڵی فریشتەکان دروست نییە، چوونکە لە ڕووناکی دروست کراون و پێویستییەکی ئەوتۆش نییە بۆ نواندنی ڕۆڵیان.

د– لە نواندنی ڕۆڵی هاوەڵەکانیشدا، زانایان ڕاجیاییان هەیە، هەندێ زانا پێیان وایە دروست نییە، هەندێکی دیکە پێیان وایە دروستە، بەشی سێیەم پێیان وایە ڕۆڵی هەندێکیان دروست نییە وەکو: چوار جێنیشنەکان، یان ئەو دە هاوەڵەی مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە.

هۆکاری حەرامی لای هەندێ لە زانایان، بۆ ئەو پلە و پایە گەورەیەی هاوەڵەکان دەگەڕێتەوە، نەوەك نواندنی ڕۆڵیان لە لایەن هەندێ ئەکتەرەوە ببێتە هۆی لە کەدارکردنی کەسایەتی و پلەیان.[٤٤]

بۆ یەکلاییکردنەوەی ڕای پەسند، پێویستە ئەو بابەتە لەلایەن لیژنەیەکی زانستی شەرعییەوە بڕیاری لەسەر بدرێت، هەروەها بابەتەکانی دیکەش کە ڕاجیاییان لەسەرە، وەکو: نواندنی ڕۆڵی ئافرەتان و لاساییکردنەوەی بێباوەڕان... هتد، پێویست دەکات شێوازێك دابڕێژرێت کە لە ڕێسا شەرعییەکان دەرنەچێت.

---

[٤٤] الفن المعاصر، لا: ٥٧.

## هونەرە دەنگییەكان (الفنون الصوتية)

مەبەست لە هونەرە دەنگییەكان، هونەری گۆرانی و مۆسیقایە.

**هونەری گۆرانی (الغناء):**

گۆرانی، بریتییە لە گوتنەوەی هۆنراوە، یان پەخشان، بە ئاوازێكی دیاریكراو. ئەو گۆرانییەی كە بەبێ مۆسیقایە و وشەكانی لە ڕووی شەرعەوە شیاون و ئاوازەكەی نەشیاو نیە، هەروەها بۆ مەبەستی خراپ بەكار نایەت، زانایان ڕاجیان لەسەری:

لە لای ڕای یەكەم دروستە، ئەوەش لە بەشێك لە هاوەڵەكانەوە گێڕدراوەتەوە، هەروەها ڕای (أبو طالب المكي و ئیمامی غەزالی و بەشێك لە حەنەفییەكان و ڕیوایەتێك لە ئیمامی ئەحمەد و هەندێ زانای حەنبەلی و ابن حزم)ە. لە لای ڕای دووەم دروست نییە، كە ئەوەش لە بەشێك لە هاوەڵەكان و تابیعییەكان گێڕدراوەتەوە و ڕای (ابن القیم) و كۆمەڵێك لە زانایانی هەر چوار مەزهەبی لەسەرە. لە لای ڕای سێیەم ناپەسندە، ئەوەش لە (ابو حنیفە) دەگێڕنەوەو ڕای زۆربەی مالیكییەكان و شافعییەكان و ڕیوایەتێك لە ئیمامی ئەحمەدەی لەسەرە.[٤٥] بەڵام دوو جۆر گۆرانی هەن كە گشت زانایان كۆكن لەسەر دروستیی، ئەویش بریتین لە (الحِداء) و (النصب).

(حداء) واتە لێخوڕینی و شترە بە جۆرە گۆرانییەكی تایبەت.

(النصب) پێی دەوترێت گۆرانیی سواران (غناء الركبان)، جۆرە گۆرانییەكە وەكو (حداء)، بەڵام ناسكترە.[٤٦]

---

[٤٥] ممارسة الفن، لا: ٨٩.

[٤٦] لسان العرب بەرگی: ٧، لا: ٤٤٣٧، فتح الباري، بەرگی: ١٠، لا: ٥٥٤.

لــە فەرمودەكانــدا دەردەكــەوێ كــە ئــەو جــۆرە گۆرانییانــە بــۆ ئــەم مەبەستانەی خوارەوە بەكاردێت:

١- چالاككردن و هاندان لەسەر كاركردن و گورجوگۆڵی.

٢-حەسانەوەی دڵ و لادانی بێزاری.

٣- هاندان و لێخوڕینی وشتر و وڵاغ و ئاگاداركردنەوەیان بۆ هەڵسان بـە بارە گرانەكانیانەوە.

٤- بەرگریكردن لە پێغەمبەر و لە ئیسلام و موسڵمانان.

٥- بۆ تكا و داواكردنی پێویستییەكان لە خاوەن دەسەڵاتەكان.[٤٧]

زانایان یەكدەنگن لەسەر ئەوەی ئەو گۆرانییەی بانگەواز بۆ قسەی ناحەق و تاوانكاری دەكات، یان هۆكارێكە بۆ بێئاگایی لە عیبـادەت و خواپەرسـتی، یان بۆ بڵاوكردنەوەی ناحـەقی و تـاوان، ئـەوە حەرامـە، ئـیتر بـە مۆسـیقاوە بێت، یان بێ مۆسیقا. لە قورئاندا دەقێكی ڕاشكاو (قطعي)مان نییـە لەسـەر حەرامیی گۆرانی بە ڕەهایی، بەڵكوو ڕاڤەكردنی هاوەڵەكان بۆ هەندێ ئایـەت هەیـە، كـە مەبەسـت پێـی گـۆرانی بێـت، بـەڵام زانایـانی دیكـە لێكدانـەوەی دیكەیان بۆ كردووە، ئەمانەی خوارەوە بەشێكن لەو بەڵگانە:

١- خوای گەورە دەفەرمێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ و يَتَّخِذَهَا هُزُوًا أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ﴾ [لقمـان: ٦] واتـە: هەندێ لە خەڵكی هەن قسە و باسی بێهوودە دەكڕن (وەك ئەفـسانە و گـۆرانی و مۆسیقا) بۆ ئەوەی بە نەزانی خـەڵك لـە ڕێگـای خـوا گـومڕا بكـات و ڕێگـای خـوا دەكاتە جێگای گاڵتە و لاقرتی، ئەوانە سزای ڕیسواكەریان بۆ هەیە.

---

[٤٧] ممارسة الفن، لا: ٨٤.

هەندێ هاوەڵ ـ وەکو ئیبن عەباس و ئیبن مەسعوود و ئیبن عومەر ـ دەڵێن مەبەست لە (لهوالحدیث) گۆرانییە (الغناء) و ئیبن مەسعوود سوێندی لەسەر خواردووە.[٤٨]

بەڵام ئەم تێبینییانەی خوارەوە لەسەر ئەو بەڵگەهێنانەوە هەن:

أ– وشەی (لهو الحديث) بە واتای دیکە لێکدانەوەی بۆ کراوە، وەکو: هاوبەش پەیاکردن بۆ خوا (الشرك)، قسەی بەتاڵ و بێ بنەما (القول الباطل).[٤٩]

ب– ڕاڤەکردنی و شەی (لهو الحديث) بەڵگەیەکی ڕاستەوخۆ نییە لەسەر حەرامیی گۆرانی، چوونکە ئیسلام بە چەندان بەڵگەی تایبەت گۆرانیی بە ڕەهایی حەرام نەکردووە، لەو بەڵگانەیش ئیبن عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ: "أنكحت عائشة ذات قرابة لها من الأنصار، فجاء رسول الله ﷺ فقال: ((أهديتما الفتاة؟)) قالوا: نعم، قال: ((أرسلتم معها من يغني؟)) قالت: لا، فقال رسول الله ﷺ: ((إن الأنصار قوم فيهم غزل. فلو بعثتم معها من يقول أتيناكم أتيناكم فحيانا وحياكم))[٥٠]، واتە: عائیشە ﷺ خزمێکی بە پیاوێکی ئەنساری بە شوو دا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: "کچەکەتان ڕەوانە کرد؟" گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: "کەسێکتان لەگەڵ نەنارد گۆرانی بڵێ؟" گوتیان: نەخێر، فەرمووی: "ئەنسارییەکان خەڵکێکن پێدا هەڵگوتنیان لەناودا هەیە، کەسێکتان ناردبا بڵێ: هاتینە لاتان هاتینە لاتان، سڵاومان لێ بێت و سڵاوتان لێ بێت".

[٤٨] بڕوانە: تفسير ابن كثير، بەرگی: ٦، لا: ٣٣٠.

[٤٩] بڕوانە: تفسير ابن كثير، بەرگی:٦، لا: ٣٣١

[٥٠] سنن ابن ماجە، بەرگی: ١، لا: ٦١٢، ژمارەی فەرموودە: ١٩٠٠.

هەر وەکو هەموو کاتبەسەربردنێك و ڕابواردنێك (لهو) حەرام نییە، لە فەرمودەی عائیشەدا ﵂ هاتووە:"أنها زفت امرأة الى رجل من الأنصار، فقال نبي الله: ((يا عائشة ما كان معَكم من لهو فإنّ الأنصار يعجبهم اللهو))[٥١]. واتە: ئافرەتێك بە بووك بردرا بۆ پیاوێکی ئەنساری، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: "ئەی عائیشە هیچ یاری و خۆشییەکتان (لهو) لەگەڵ بوو؟ ئەنسارییەکان حەز لە یاری و خۆشی (لهو) دەکەن". بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوامی و زێدەڕۆیی لە حەڵاڵدا دەبێتە تاوان، هەروەکو ئیمامی غەزالی فەرموویەتی: "فان المواظبة على اللهو جناية".[٥٢]

لەوەدا بۆمان ڕووندەبێتەوە کە کڕینی (لهوالحديث) و لێکدانەوەی بە گۆرانی، مەبەست پێی ئەو گۆرانییەیە کە بە وشە و جووڵە و مەبەستی نابەجێ، خەڵکی لە ڕێی خوا لادەدات، کە ئەوەش لە نێوان زانایانجێی ناکۆکی نییە. ئەوەی زیاتر ئەوەش ڕووندەکاتەوە، فەرموودەی خوایە (سبحانه): (لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ) واتە: بۆ ئەوەی خەڵکی لە ڕێی خوا گومڕا بکات.

٢- فەرمودەی خوای گەورە: (وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِصَوْتِكَ و أَجْلِبْ عَلَيْهِمْ بِخَيْلِكَ و رَجِلِكَ و شَارِكْهُمْ فِي الْأَمْوَالِ و الْأَوْلآدِ و عِدْهُمْ و مَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلآ غُرُورًا) [الاسراء ٦٤] واتە: هەر کەسێ لەوانە کە دەتوانی گومڕای بکە بە دەنگت (گۆرانی) و بەسەریاندا بدە و تێیان بخوڕە بە سوار و پیادەی لەشکرەکەتەوە، هاوبەشیان بکە لە ماڵ و سامان و منداڵیاندا و بەڵێنیان پێ بدە، بەڵام شەیتان بەڵێنیان پێ نادات تەنیا خەڵەتاندن نەبێت.

---

[٥١] صحيح البخاري مع شرحه فتح الباري، بەرگی: ٩، لا:٢٨١، ژمارەی فەرموودە: ٥١٦٢.

[٥٢] احياء علوم الدين، بەرگی: ٢، لا: ٤٥٨.

زانایـانی تەفـسیر ڕاجیاییـان لەسـەر واتـای (بـصوتك) هەیـە، لێکیـان داوەتـەوە بـە: گـۆرانی، دەنگـی زوڕنـا (مزمـار)، وەسوەسـە. ئـیبن عـەباس دەفەرموێ: "هەر بانگخوازێك خەڵکی بۆ تاوان بـانگ بکـات".[53] لـە ڕاسـتیدا شەیتان بانگی خەڵکی دەکـات بـۆ گـشت تاوانـەکان، لـە ڕێگـای گۆرانییـەوە بێت، یان مۆسیقا، یان وەسوەسە، کـە هـەر دەنگێکـیش خـەڵکی بـۆ تـاوان بانگ بکات، گومانی تێدا نییە کە حەرامە.

٣- فەرموودەی خوای گەورە: (أَفَمِنْ هَذَا الْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ، و تَضْحَكُونَ و لاَ تَبْكُونَ ، و أَنْتُمْ سَامِدُونَ ) [النجم ٥٩-٦٢] ، واتـە: جـا لـەو وتـە کـە قورئانە سەرتان سوڕدەمێنێ؟ وە پێدەکنن و ناگرییێن و ئێوە سەرگەرم و بێ ئاگان. زانایانی تەفسیر چەند واتایەکیان بۆ و شەی(سامدون) داناوە، لەوانە: گۆرانی، ڕوو وەرگێڕان (اعراض)، خ بەگەورەزانین، خۆخەریککردن بە گاڵتـە و گەمە (اللهو)[54]. گومانی تێدا نییە گۆرانی و ڕوو وەرگێڕان و پشت تێکردن، خۆسەرقاڵ کردن لە کاتی دابەزینی قورئانـدا، یـان لـە کـاتی خوێندنـەوەی و گاڵتەپێکردنی، حەرامن.

٤- هەندێ ئایـەتی دیکـە کـە واتـای گـشتییان هەیـە، وەکـو: (وَالَّذِينَ لاَ يَـشْهَدُونَ الـزُّورَ و إِذَا مَـرُّوا بِـاللَّغْوِ مَـرُّوا كِرَامًـا) [الفرقـــان: ٧٢] ، واتـــە: (بەندەکانی خوا) کەسانێکن کە شاهێدیی درۆ نادەن و کاتێ تێپەڕ بن بە لای شتی بـێ سـووددا (ئـەنجام بـدرێ لـە لایـەن نەفامانـەوە) تێپـەڕ دەکـەن بـە ڕێزەوە (بێ گوێدانە نەفامان).

---

[53] بڕوانە تفسیر ابن کثیر، بەرگی: ٥، لا: ٩٣.

[54] هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگی: ٧، لا: ٤٦٨.

هەروەها ئایەتی: (وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ و قَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا و لَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ لاَ نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ ) [القصص: ٥٥] ، واتە: وە کاتێ قسەی ناپەسەند و هیچ و پووچ ببیستن، پشتی تێ دەکەن و دەڵێن (بە نەفامان) ئەنجامی کردەوەکانمان بۆ خۆمانە و ئەنجامی کردەوەکانی ئێوەیش بۆ خۆتانە، سەلامتان لێ بێ ئێمە هاوڕێیەتیی نەفامانمان ناوێ.

هەموو درۆ و قسەیەکی نابەجێ لە شاهێدی دان، یان لە کۆڕ و کۆبوونەوەکان، یان گۆرانی، تاوانە، ئایەتەکە دەربارەی قسەو وتەی خراپ و نابەجێیە، هەرچەندە لە کۆڕ و مەجلیسی پیاوچاکانیشدا بێت، مانەوە لەو کۆڕ و مەجلیسانەدا دروست نییە، مەگەر ئینکاری بکرێت و ڕێی لێبگیرێت.

٤- لەو بەڵگانەی کە لە هاوەڵەکان و تابیعییەکان لەسەر دروستیی گوێگرتن لە هەندێ جۆری گۆرانی دەگێڕنەوە، ئەمانەن:

أ- عن وهب بن كيسان قال قال عبدالله بن الزبير وكان متكئا:"تغنّ بلال، قال: فقال له رجل تغنى؟ فاستوى جالسا، ثم قال: وأي رجل من المهاجرين لم أسمعه يتغنى النصب". [٥٥]

ب- عن ابن جريج قال: سألت عطاء عن الغناء بالشعر فقال: "لا أرى به بأسا مالم يكن فحشا". [٥٦]

ئەو ڕیوایەتانە بەڵگەن لەسەر دروستیی گۆرانی و حەڵاڵبوونی، کە ژەنین و مۆسیقای لەگەڵ نەبێ جگە لە دەف، بۆ بۆنەیەك بێت یان بێ بۆنە، خۆیان بیڵێن یان بۆیان بوترێت.

---

[٥٥] سنن البيهقي الكبرى، بەرگی: ١٠، لا: ٢٢٥، ژمارەی فەرموودە:٢٠٨٠٧

[٥٦] سنن البيهقي الكبرى، بەرگی: ١٠، لا: ٢٢٥، ژمارەی فەرموودە: ٢٠٨٠٨

## ئامێرەكانی مۆسیقا

مۆسیقا بە گشتی سێ جۆری هەیە:

یەكەم: ئەوانەی لە ڕێگەی لێدانی ئامێرەكەوە دەنگ دەردەكات، وەكو: تەپڵ و دەف و خەڵخال(ئەلقەی دەف).

دووەم: ئامێرە سەردەمییەكان، وەكو: ئیقاعات لە ڕێگای كۆمپیوتەرەوە.

سێیەم: ژەنەرەكان (المعازف)، لە ڕێگای فوولێكردنەوە دەنگ دەربكات، وەكو: شمشاڵ و زوڕنا. یان لە ڕێگای لەراندنەوەی وەتەرەكان، وەكو: عوود و ڕەباب و كەمان. حوكمی هەر یەكێك لەو جۆرانە و ئامێرەكان، لەم بڕگانەی خوارەوە ڕووندەكەینەوە:

## لێدانی دەف و گوێلێگرتنی بۆ ئافرەتان:

زانایـان یەكـدەنگن لەسـەر دروسـتیی لێـدانی دەف بـۆ ئافرەتـان و گوێلێگرتنی، بەڵام ڕاجیاییان لەسەر كات و بۆنەی لێدان و گوێگرتنی هەیە:

ڕای یەكەم: لێـدانی دەف و گـوێلێگرتنی بـۆ ئافرەتـان، تـەنیا لـە بۆنـەی هاوسـەرگیری و جەژنـدا دروسـتە، لای هەنـدێك تـەنیا لـە كـاتی دەرچـوونی ئافرەت لە هاوسەرگیری بۆ لای ئافرەتان دروستە، واتە بۆ چەند خولـەكێكی كەم.

ڕای دووەم: لێـدانی دەف و گـوێلێگرتنی بـۆ ئافرەتـان، لـە گـشت بۆنـە شەرعییەكان بەبێ دیاریكردنی هۆكار و كاتێكی دیاریكراو، دروستە، چوونكە ئەسڵ لە لێدانی دەف و گوێلێگرتنی بۆ ئافرەتان، دروستییە، نەك بۆنەیەكی دیاریكراو.

## لێدانی دەف و گوێلێگرتنی بۆ پیاوان، دوو ڕای لەسەرە:

ڕای یەکەم: لێدانی دەف و گوێلێگرتنی بۆ پیاوان، دروست نییە، چوونکە هیچ بەڵگەیەك لەسەر دروستیی نییـە، ئـەوەی گێڕدراوەتـەوە لـە گـوێگرتنی پێغەمبەر ﷺ، لە تایبەتمەندییەکانی پێغەمبـەربووە ﷺ، یـان ڕێپێدانەکـە لـە چـەند بۆنەیـەکی تایبەتـدا بـووە، وەکـو گەڕانـەوە لـە سـەفەردا (عـودە الغائب).

ڕای دووەم: لێدانی دەف و گوێلێگرتنی بۆ پیاوان دروستە، بەو بەڵگانەی لەسـەر گـوێگرتنی پێغەمبـەر و ﷺ هاوەڵـەکان هـەن[٥٧]، هـەر وەکـو لـەو ڕیوایەتانەی خوارەوە هاتووە:

١- بریده الاسلمی دەڵێ: "عن عبدالله بن بريدة قال سمعت بريـدة (رضي الله عنه) يقول خـرج رسـول الله (ﷺ) في بعـض مغازيـه فلمـا انـصرف جـاءت جاريـة سوداء فقالت يا رسول الله إني كنت نذرت إن ردك الله صـالحا أن أضـرب بـين يديك بالدف وأتغنى فقال لها رسـول الله (ﷺ) إن كنـت نـذرت فاضـربي وإلا فلا"[٥٨].

عەبدوڵلای کوڕی بریده دەڵێ: گوێم لـە بریـدە بـوو فـەرمووی: پێغەمبـەر (ﷺ ) بۆ غەزایەك دەرچوو، لەو کاتەی گەڕایـەوە کیژۆڵەیـەکی ڕەشپێـست گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا مـن نـەزرم کردبـوو ئەگـەر خـوای گـەورە بـە سـەلامەتی گێڕایتیـەوە لـە پێـشوازیتدادەفت لـێ بـدەم و گـۆرانی بڵـێم، پێغەمبەریش ( ﷺ ) فەرمووی: ئەگەر نەزرت کردووە دەف لێ بدە، ئەگەر نا لێی مەدە.

٢- گوی گرتنی پێغەمبەر (ﷺ) لە دەنگی دەف ڕۆژی جەژن،

[٥٧] الفن المعاصر، لا: ٦٨.

[٥٨] سنن الترمذي، بەرگی: ٥، لا: ٦٢٠، ژمارەی فەرموودە: ٣٦٩٠، قال الترمذي: هذا حديث حسن صحيح غريب.

عـن عائـشة : أن أبـا بكـر (رضي الله عنه) دخـل عليهـا وعنـدها جاريتـان في أيـام منـى تـدففان وتـضربان والـنبي ﷺ مـتغش بثوبـه، فانتهرهمـا أبـو بكـر فكـشف الـنبي (ﷺ)عن وجهه فقال: ((دعهما يا أبـا بكـر فإنهـا أيـام ُعيـد وتلـكَ الأيـام أيـام منـى))[٥٩]، واتــه: لــه عائيــشه‌وه ده‌گێڕنــه‌وه، كــه ئه‌بووبــه‌كر هاتــه ژووره‌وه لای عائيشه (رضي الله عنها) له‌و كاته‌ی دوو كيژۆڵه‌ی لابوون له ڕۆژه‌كـانی مينـادا ده‌فيـان لــێ ده‌دا، پێغه‌مبــه‌ريش (ﷺ )خــۆی بــه جلوبه‌رگــه‌كانی داپۆشــيبوو. ئه‌بووبه‌كر تێی خوڕين، به‌ڵام پێغه‌مبه‌ر ( ﷺ) ڕووی ده‌رخست و فه‌رمووی: ئه‌بووبه‌كر وازيان لێ بێنه، چوونكه ئه‌م ڕۆژانه جه‌ژنن. ڕۆژه‌كان، ڕۆژانی مينا بوون.

ئه‌گه‌ر ده‌فژه‌نين بۆ ئافره‌تان دروست بێت، ئـه‌وا بـۆ پيـاوانيش به‌هـه‌مان شێوه‌يه، چوونكه هيچ به‌ڵگه‌يه‌ك نييه تايبه‌تی بكات به ئافره‌تان (مخصص) به‌ڵكوو فـه‌رمان كـراوه بـه پيـاوان، هـه‌روه‌كو عائـشة (رضي الله عنها ) ده‌گێڕێتـه‌وه: كـه پێغه‌مبه‌ری خوا فه‌رمويـه‌تی(ﷺ): ((أعلنـوا هـذا النكـاح واجعلـوه في المـساجد واضــربوا عليــه بالــدفوف))[٦٠]، واتــه: پێغه‌مبــه‌ر ﷺ فه‌رموويــه‌تی: ئــه‌و هاوسه‌رگيرييه ڕابگه‌يه‌نن و له مزگه‌وته‌كان دايبنێن و ده‌ف بۆ لێبده‌ن.

هه‌ر وه‌كو هيچ به‌ڵگه‌يه‌كيش نييه گوێگرتنی ده‌ف بۆ پياوان تايبه‌ت بكات به كاتێكی دياريكراو، چوونكه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) له كات و بۆنه‌ی جياوازدا گوێی لێگرتووه، نه‌ك ته‌نيا له جه‌ژندا.

---

[٥٩]صحيح البخاري، به‌رگی: ١، لا: ٣٣٥، ژماره‌ی فه‌رمووده: ٩٤٤، صحيح مسلم، به‌رگی: ٣، لا: ٢١، ژماره‌ی فه‌رمووده: ٢١٠٠.

[٦٠]سنن الترمذي، به‌رگی: ٣، لا: ٣٩٨، ژماره‌ی فه‌رمووده: ١٠٨٩، قال الترمذي: هذا حديث غريب حسن.

## لێدانی تەپڵ و گوێلێگرتنی

وشەی (طبل) لە فەرموودەدا نەهاتووە، بەڵام و شەی دیکە هاتووە کە واتای تەپڵ دەگەیەنێ. زانایان سێ ڕایان لەسەر تەپڵ هەیە:

ڕای یەکەم: گوێگرتن لە تەپڵ و لێدانی حەرامە، بە بەڵگەی فەرموودەی:((ان الله حرم عليّ، أو حرم الخمر والميسر والكوبة، وكل مسكر حرام)) قال سفيان قلت لعلي بن بذيمة ما الكوبة قال الطبل [61]، واتە: خوا (سبحانە) مەی و قومار و کوبەی حەرام کردووە، هەر شتێکیش سەرخۆشکەر بێت، حەرامە. دەڵێن (کوبة) واتە: تەپڵ.

ڕای دووەم: حەرامیی تەپڵ بە ڕەهایی نییە، بەڵکوو لە هەندێ بۆنەدا دروستە، وەکو: بۆنەی هاوسەرگیری و غەزا و حەج و ئاگادارکردنەوە لە کاتی پارشێوان (طبل المسحر)، جگە لەو بۆنانە هەندێ زانا پێیان وایە ناپەسندە (مکروه).

کە وابوو تەپڵ لەبەر خودی خۆی حەرام نییە و بەڕەهایی حەرام نییە، بەڵکوو لە هەندێ بۆنەدا دروست و لە هەندێکی دیکەدا حەرامە.

(ابن عابدين) دەڵێ: "اذا كان الطبل لغير لهو فلا بأس به".[62] واتە: ئەگەر تەپڵ بۆ کاتبەسەربردن و ڕابواردن نەبێت، تاوان نییە. (القرطبي) دەڵێ: "فاما طبل الحرب فلا بأس به".[63] واتە: تەپڵی جەنگ تاوانی لەسەر نییە.

ڕای سێیەم: گوێگرتن لە (طبل) دروستە، تەنیا جۆرێکیان نەبێت کە (کوبة)یە و جۆرێکە لە جۆرەکانی (طبل).

[61] مسند أحمد بن حنبل، بەرگی: ١، لا: ٢٧٤، ژمارەی فەرموودە: ٢٤٧٦، إسناده صحيح.

[62] حاشية ابن عابدين، بەرگی: ٦، لا: ٣٣٩.

[63] الجامع لأحكام القرآن، بەرگی: ١٤، لا: ٥٣.

(کوبة) جۆرە تەپڵێکی درێژە، سەرەکانی فراوانن و ناوەندی تەنگ و تەسکە. ئەو کەسانەی ئەو جۆرانەیان بەکاردەهێنا، خۆیان بە ئافرەتان دەچوواند، لەبەر ئەوە حەرام کرا. ئیمامی نەوەوی دەفەرمووێ: "ولا يحرم ضرب الطبول الا الكوبة"[٦٤]، واتە: لێدانی تەپڵ حەرام نییە، تەنیا کوبە نەبێت.

سەبارەت بەو ئەڵقانەی بە دەفەوەن و پێیان دەوترێت (خلاخل)، هەندێ زانا پێیان وایە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ هەبووە، کە وابوو دروستە، هەندێکی دیکە پێیان وایە لەو سەردەمەدا نەبووە، بۆیە حەرامە، یان ناپەسندە (مكروه)، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی ڕاشکاو (صريح) لەسەر حەرامیی نییە.

## ئامێرە سەردەمییەکان لە ڕێگای کۆمپیوتەرەوە

١- دەنگی مرۆڤ: مەبەست دەنگی بێژەرە بە دەنگی سروشتیی خۆی، کە پاشان دەخرێتە ناو ئامێری (مسجل) و دەستکاریی دەنگەکە دەکرێ بۆ ئەوەی لەگەڵ سروودەکە بگونجێ، یان لەگەڵ دەنگی دیکەی مرۆڤ تێکەڵ دەکرێ، ئەو جۆرەیان دروستە.

٢- الايقاعات:حوکمی بەپێی دەرەنجامی دەنگەکە دەگۆڕێ، دەنگی مرۆڤ ، یان دەنگی مۆسیقا، یان دەنگی دیکە بێت.

لە زاراوەی ئەم سەردەمەدا دوو جۆر ئیقاع هەیە:

یەکەم: ئامێری ئیقاعی کۆن: بریتییە لە ئامێرێك کە کۆمەڵێك دوگمەی لەسەرە، هەر دوگمەیەك دەنگێکی تایبەتی لەسەر تۆمار کراوە، ئەگەر

[٦٤] روضة الطالبين، بەرگی: ١١، ل:٢٥٣.

دایگریٚ، دەنگێك دەردەكا جیاوازە لەگەڵ دەنگی دوگمەیەكی دیكە، لەوانەیە دەنگی دوگمەیەك دەنگی دەف بێت، دوگمەیەكی دیكە دەنگی چەپڵە بێت، دەگمەیەكی دیكە دەنگی مۆسیقا بێت. حوكمی ئەم جۆرە دەوەستێتەوە سەر ئەسڵی دەنگەكە، ئەگەر دەنگی دەف بێت، یان دەنگی مرۆڤ بێت، دروستە.

دووەم: ئامێری ئیقاعی نویٚ: بریتییە لە ئامێری كۆمپیوتەر، كە كۆمەڵێك دەنگی لەناودا تۆمار كراوە، دەنگی مرۆڤ و مۆسیقا، جگە لە كۆمەڵێك بەرنامە.[٦٥] ئەگەر بێژەری سروودێك دەنگی مرۆڤی بەكار هێنا، ئەوە پێی دەوترێت ئیقاعی بیٚ مۆسیقا، ئەگەر دەنگی مۆسیقای بەكار هێنا، ئەوە ئیقاعی مۆسیقاییە. ئەگەر دەنگەكان، دەنگی مرۆڤ و سروشتی بوون، ئەوە دروستە، ئەگەر دەنگی مۆسیقا بوون، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ حوكمی مۆسیقا.

بەڵام پێویستە ئەوە ڕەچاوبكریٚ كە دەنگە مۆڤییەكان، دەنگی شیاو بن، نەك دەنگی دوور لە ڕەوشت و شەرع.

## بەرنامەكانی كاریگەریی دەنگی لە كۆمپیوتەردا (المؤثرات الصوتية).

بۆ زیاتر تایبەتكردنی بابەتەكە، وەك نموونەیەك باسی بەرنامەیەك دەكەین، كە بەرنامەی (سامبلر)ە. بریتییە لە بەرنامەیەك لەناو ئامێری تۆمار (مسجل)، یان كۆنترۆڵی دەنگ (التحكم الصوتي)دا دادەنریٚ، دەنگی مرۆڤ دادەڕێژێتەوە، یان هەر دەنگێكی دیكە بەپێی و یستی خاوەنی (بەكارهێنەری).

---

[٦٥] الفن المعاصر، لا: ٧٦.

ئەم بەرنامەیە کۆمەڵێك نموونەی جیا کۆدەکاتەوە، وەکو: دەنگی مرۆڤ و دەنگی هاژەی ئاو و دەنگی باو و باران، یان دەنگی تەختە و شووشە و... هتد، هەروەها ئامێرەکە دەتوانێت دەنگی مۆسیقاش وەربگرێت.

کە وابوو بەرنامەی (سامبلر) لە بنەڕەتدا مۆسیقا نییە و ئامێرێکی مۆسیقایی نییە، بەڵکوو کۆنترۆڵی دەنگەکان دەکات، جا هەر جۆرە دەنگێك بێت.[٦٦] حوکمی ئەو جۆرە دەوەستێتەوە سەر دەنگەکان، ئەگەر دەنگی مرۆڤ و سروشتی بوو، ئەوە دروستە، ئەگەر دەنگی مۆسیقا بوو، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ حوکمی مۆسیقا.

## ئامێرەکانی ژەنین (آلات الموسیقى):

لێرەدا گرنگترین ئەو بەڵگانە دەخەینە ڕوو کە ئەوانەی مۆسیقا بە حەرام دادەنێن، پشتی پێدەبەستن:

١- فەرموودەی: أبو مالك الأشعري سمع النبي ﷺ يقول: ((ليكونن من أمتي أقوام يستحلون الحر والحرير والخمر والمعازف))[٦٧]، واتە: خەڵکێك لە ئوممەتی من پەیدا دەبن، زینا و ئاوریشم و مەی و ژەنین حەڵاڵ دەکەن.

ئەو فەرموودەیە بەهێزترین بەڵگەی ئەوانەیە کە مۆسیقا بە حەرام دادەنێن، وشەی (معازف) ئامێرەکانی ژەنینە (الات العزف) کە بە مۆسیقا ناودەبردرێت.

دروستیی فەرموودەکە لە لای ئەوانەی پێیان وایە مۆسیقا حەرامە، ناکۆکیی لەسەر نییە، هەروەها لای ئەوانەی پێیان وایە دروستە، بەڵام

---

[٦٦] الفن المعاصر، لا: ٧٨.

[٦٧] صحيح البخاري، بەرگی: ٥، لا: ٢١٢٣، ژمارەی فەرموودە: ٥٢٦٨.

ئەوانەی پێیان وایە دروستە دەڵێن حەرامییەکە بۆ کۆبوونـەوەی ئـەو شـتانە بەیەکـــەوە دەگەڕێتـــەوە، نـــەوەك بـــۆ خـــودی مۆســـیقا (المعـــازف)، کـــە فەرموودەکە وا دەردەخات خەڵکێك خەریکی زێدەڕۆی و فەسادی و ڕابواردن و گۆرانی و مەی خواردنـەوە و لەبـەرکردنی ئاوریـشمن، بـە بەڵگـەی ئـەوەی هەنـدێ شـتی تێدایـە لـە خـودی خۆیانـدا حـەرام نـین، وەکـو ئاوریـشم بـۆ ئافرەتان.

٢– فـەرموودەی: عـن ابـن سـابط قـال قـال رسـول الله (ﷺ): ((إن في أمـتي خَسفا ومَسخا وقَذفا، قالوا: يا رَسولَ الله وهم يَشهدون أنْ لا إلـه إلا الله، فقـال: نَعـم، إذا ظَهرَت المعازفُ والخمورُ ولبسُ الحريـر))". [٦٨] واتـە: لە ئوممـەتی مـن خـەڵکێك بە زەویدا ڕۆدەچن، وشێوەیان دەگۆڕێ و بـەردباران دەکـرێن، گوتیـان ئـەی پێغەمبەری خوا ئەوانە شاهێدییش دەدەن کە هیچ خوایەك نییە تەنیا خوای تاك و بێ هاوتا نەبێ، فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر ژەنین و مـەی سـەری هەڵـدا و ئاوریشم پۆشرا.

ڕوونکردنـــەوەی ئـــەو فەرموودەیـــەش بـــە هـــەمان شـــێوەی فـــەرموودەی پێشترە.

٣– عن نافع مـولى بـن عمـر ((أن ابـن عمـرؓ سمـع صـوتَ زمـارةَ راعٍ فوضـع إصبعيهِ في أُذنَيه وعَدل راحلتَهُ عن الطريقِ وهو يقـول يـا نـافع أتـسمع؟ فـأقول نعـم فيَمضي حتى قُلت لا فوضعَ يَدَيه وأعادَ راحِلَتَـهُ إلى الطَريـق، وقـال رأيـتُ رسـولَ اللهِ ﷺ سمعَ صوتَ زمارةَ راعٍ فَصنَعَ مثـلَ هـذا))". [٦٩] واتـە نـافیع دەگێڕێتـەوە کـە عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر دەنگـی زوڕنـای شـوانێکی بیـست، ئـەویش دوو

[٦٨] مصنف ابن أبي شيبة، بەرگی:٧، لا: ٥٠١، ژمارەی فەرموودە: ٣٧٥٤٥.

[٦٩] مسند أحمد بن حنبل، بەرگی: ٢، لا: ٨، ژمارەی فەرموودە: ٤٥٣٥.

پەنجەی لەناو گوێیەکانی ناو ولاغەکەی لە ڕێگا لادا و فەرمووی: ئەی نافع دەبیستی؟ منیش گوتم: بەڵێ. بەردەوام بوو تا گوتم: گوێم لێ نییە، دەستەکانی دانا و ولاغەکەی گێڕایەوە سەر ڕێگای و فەرمووی: پێغەمبەرم ﷺ بینی گوێی لە دەنگی زوڕنای شوانێ بوو، وەکو ئێستای منی کرد.

فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر نەفرەتی پێغەمبەر ﷺ لە گوێگرتن لە مۆسیقا (معازف)، گوێگرتن لە مۆسیقا لە خودی خۆیدا بێ ئاگاییە لە زۆرێك کاری چاکە، پێویستە زانا و پیاوچاکان (اهل العلم و الفضل) خۆیانی لێ بپارێزن و شوێنکەوتووی پێغەمبەر بن ﷺ.

ئەوانەی پێیان وایە دروستە، دەڵێن: کاری (ابن عمر) بەڵگەیە لەسەر حاڵەتی تەواوترین و باشترین، نەك واجببوون، چوونکە خۆبەدوورگرتنە (امتناع) لە شتێك کە بەڵگەیەکی ڕاشکاو لەسەر حەرامبوونی نییە.

# باسی سێیەم
# تایبەتمەندییەکانی هونەری ئیسلامی

ئەگەر ئیسلام تێڕوانینی تایبەتی خۆی بۆ بوونەوەر هەبێت، ئەوە هونەری ئیسلامییش تایبەتمەندیی خۆی هەیە کە لە هونەرەکانی دیکە جودای دەکاتەوە، ئەو تایبەتمەندییانەش هەڵقوڵاوی تێڕوانینی ئیسلامن بۆ بوونەوەر و هەڵقوڵاوی مەبەستە بەرزەکانییەتی. گرنگترین ئەو تایبەتمەندییانەش بریتین لە:

١– هونەری ئیسلامی لەسەر بنەمای بیروباوەڕی ئیسلامی و تێڕوانینی گشتگیری بۆ مرۆڤ و بوونەوەر و ژیان، لەسەر خواپەرستی بۆ خوای تاك و ئازادبوون لە ئەفسانە (اساطیر) کە کەرەستەی سەرەکیی هونەرە نائیسلامییەکانە، دادەمەزرێ.[٧٠]

[٧٠] میادین الجمال في الظاهرة الجمالية في الاسلام، لا: ٢١٣. الشريعة الاسلامية و الفنون، لا: ٣٣.

٢- ئەگەر ئەركی هونەر دروستكردنی جوانی بێت، ئەوە هونەری ئیسلامی بەوە لە هونەرەكانی دیكە جیادەكرێتەوە كە تێڕوانینی بۆ جوانیی هەمەلایەنانەیە (النظرة المتكاملة).

جوانی لە ئیسلامدا تەنیا لە جوانیی جەستەیی و ماددیدا قۆرغ نەكراوە، بەڵكوو جوانی بە واتا فراوانەكەی كە لە سنووری ماددەدا ناوەستێت و لە چوارچێوەیەكی دیاریكراودا قەتیس نەكراوە، جوانیی بوونەوەر بە ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەكانی و پەیوەندیی نێوانیان و هێزی ڕاكشانی نێوانیانەوە (تجاذب وارتباط). جوانیی سروشت بە چیا و ڕووبارەكان و ڕووناكییەكان و سێبەرەكانی و گیانلەبەر و بێگیانەكانیەوە. جوانیی هەستەكان و سۆزەكان بە خۆشەویستی و خێر و بەزەییەوە، جوانیی بەهاكان و بارودۆخەكان و سیستەمەكان و هزرەكان و بنەماكان... هتد.[٧١]

٣- هونەر لە دیدی ئیسلامدا، لە خودی خۆیدا مەبەست نییە، بەڵكوو ئامرازێكە بۆ مەبەستی بەرز و جوان. لە هزری مرۆڤایەتیدا و لای هەنەرمەند و فەیلەسوفەكان، دوو ئاراستە بۆ ئەركی هونەر هەن، ئاراستەیەك هونەر بە مەبەست دەزانی نەك ئامراز، گوزارشت لەم ئاراستەیە دەكرێ بە وتەی: هونەر بۆ هونەر (الفن للفن).

ئاراستەی دووەم هونەر بە ئامراز دەزانی، كە لەلای ئەوان هونەر پەیامێكی كۆمەڵایەتیی هەیە، پابەندە بە بەدەستهێنانی مەبەست و سوود بۆ مرۆڤ و كۆمەڵگا، ئەوانە گوزارشت لەو ئاراستەیە دەكەن بە وتەی: هونەر بۆ كۆمەڵگا (الفن للمجتمع).[٧٢]

---

[٧١] منهج الفن الاسلامي، لا: ١٣٥

[٧٢] التربية الجمالية الاسلامية، لا: ٢٢-٢٣

هونەری ئیسلامی هاوڕایە لەگەڵ ئاراستەی دووەم، هونەر ئامرازێکە و پەیامێکی هەیە، هەوڵ بۆ بەدەستهێنانی دەدا، بەڵام پەیامی هونەری ئیسلامی هەڵقوڵاوە لە دیدی ئیسلام بۆ بوونەوەر و هەڵقوڵاوی مەبەستە بەرز و جوانەکانیەتی کە هەوڵی بەدەستهێنانی لە ژیانی مرۆڤدا دەدات.

٤- هونەری ئیسلامی ڕەنگدانەوەی فریشکی (فطرة) مرۆڤە، هەروەها ڕەنگدانەوەی شەرع و مەنهەجی ئیسلامە، کە وابێت پاڵنەری هونەری ئیسلامی، فریشك (فطرة) و دەروونی مرۆڤەکانە، کە دڵی ئەشنێ و تامەزرۆیە بۆ جوانی (تهفوالی الجمال) و هەوڵی بۆ دەدات، هەروەها پاڵنەری دووەمیشی مەنهەجی ئیسلامە، کە داوای ڕێکوپێکیی کارەکانی و خۆشویستنی جوانیی لە مرۆڤەکان لە گشت لایەنەکانی ژیاندا کردووە، بەوەش پاڵنەری فیترەت و شەرع کۆدەبنەوە بۆ داهێنانی بەرهەمێکی هونەری کە جوانی لە گەشترین و بەرزترین وێنەکانی بەرجەستە دەکات.[٧٣]

٥- واقیعیەتی هونەری ئیسلامی: هونەری ئیسلامی گوزارشت لە واقیع دەکات، وەکو لە واقیعدا بوونی هەیە، تەنیا گوزارشت لە مێژووی کەسایەتی و کۆمەڵگەی ئیسلامی ناکات، بەڵکوو گوزارشت لە واقیعی دوور لە ئیسلام و تێڕوانینە هەڵەکانیشی دەکات، بەڵام لە سۆنگەی ئیسلامەوە بۆ بوونەوەر و ڕووداوەکان، هەر وەکو محەممەد قوتب دەڵێ: "ئەگەر زوومی وێنەگرتنی ئیسلامی، دیمەنەکان بگرێت، لێرە و لەوێ بە ئەمانەت و وردیی و واقیعیەت، بەڵام لە ئاراستەکردنیدا جیاوازە... کاتێك چرکەی دابەزینی مرۆڤ دەگری و

[٧٣] میادین الجمال، لا: ٢١٥.

تۆماری دەكات، وەكو دابەزین و لێژی و هەڵدرێر تۆماری دەكات، نەك وەكو پاڵەوانیەتییەك كە شایەنی چەپڵە و سەرسامبوون بێت". [٧٤]

٦- هونــەری ئیــسلامی هــەڵقوڵاوی دیــد و مەنهــەجی خۆیــەتی، نــەك كاردانەوەی بارودۆخـەكان، یـان ململانێـی دەروونـی و چـینایەتی، هـەروەها هونەری ئیسلامی ئازادە (متحـرر) لـە گـشت پاڵەپەسـتۆ كۆمەڵایەتییـەكان و ناكۆمەڵایەتییــەكان، هــەر ئــەم سەربەخۆبوونەشــە وای كــردووە هونــەری ئیسلامی هونەرێكی سەربەخۆ و نایاب بێت. [٧٥]

---

[٧٤] منهج الفن الاسلامي، لا: ١٢٨

[٧٥] الشريعة الاسلامية و الفنون، لا: ٣٣

# باسی چوارەم

# بەربەستەکانی گەشە پێدانی هونەری ئیسلامی

تێبینیکردنی جوانی و گرنگی پێدانی، ئەگەر خوازیار نەبێت لە لای زۆرێك لە موسڵمانان، بەڵام لە پەروەردەی ئیسلامیدا پایە و پێگەیەکی بەرزی هەیە.

لە تاقیکردنەوەی زیندوودا دەرکەوتووە کە قسەکردن لەبارەی ڕێساکانی جوانی لە هونەری ئیسلامیدا و لێکۆڵینەوە لە سروشتی مامەڵەکردنی قورئانی پیرۆز لەگەڵ دیاردەی جوانی، بەشداری لە کەمکردنەوەی توندیی بەربەستەکان دەکات، لە ڕێگای دەرخستن و هۆشیارکردنەوەی خەڵکی لە مەبەستەکانی جوانی لە هونەری ئیسلامیدا، هەر وەکو یارمەتیدەرە بۆ بەدەستهێنانی دەسکەوت لە گەشەپێدانی هونەری لای مرۆڤی موسڵمان، کە مەبەستیەتی ژینگەکەی گونجاوبێت لەگەڵ ڕێنماییەکانی قورئان لە گشت بوارەکانی ژیاندا.

توێژەرانی بواری هونەری ئیسلامی پێیان وایە هەندێ بەربەست هەن لە بەردەم گەشەکردنی هونەری ئیسلامی، قسە کردن لەسەر گەشەکردنی هونەری ئیسلامی سوودێکی ئەوتۆی نابێ ئەگەر باس لە بەربەستەکان و چارەسەرییەکان نەکەین.

دکتۆر محەممەد ئیقباڵ، توێژەری مەغریبی، چەند بەربەستێکی دەسنیشان کردووە لە بەردەم گەشەکردنی هونەری ئیسلامی و بەربەستەکانی کردووەتە دوو بەش، بەربەستە دەرکییەکان و بەربەستە ناوخۆییەکان.[٧٦]

بەربەستە دەرکییەکان

تێڕوانین بۆ بیردۆزەی هونەر وەکو بیردۆزەیەکی جیهانی

ئاراستەی گشتیی ڕۆژئاواییەکان و زۆرێك لە توێژەرە عەرەبەکان ئەوەیە کە بەرهەمی بیردۆزەی هونەر (عطاءات نظرية الفن) بیردۆزەیەکی جیهانییە، هەوڵ و کاری هونەرمەندان و ڕەخنەگران، ڕەنگێکی جیهانیی هەیە، ئەو ڕەنگ و سیمایە گشت کارەکانی بواری لێکۆڵینەوەی هونەری و ڕەخنەیی دەگرێتەوە، گشت میللەتانیش یەکسانن لەوەدا، خاوەنی بەرهەمی شارستانی و هزری بن، یان قووڵایی شارستانیەتیان نەبێت، بە زۆریش بەرهەمی هونەری ڕۆژئاوایی دەکرێتە دادوەر و پێوەر.

ئەوەی گومانی تێدا نییە، ئەوەیە کە هونەر و بیردۆزەکانی لە ڕۆژئاوادا یەکتر دەسڕنەوە، یان یەکتری تایبەت دەکەن، یان یەکتری تەواو دەکەن، ئەوەش بەڵگەیە لە سەر جیاوازی و جۆرایەتی لە دیدی ڕۆژئاوادا.

---

[٧٦] بڕوانە: عوائق التنمية الفنية، لا: ١٨٥.

پوختەی قسەکان ئەوەیە کە جیاوازی لە کولتووری ڕۆژئاوادا بوونی هەیە، لەگەڵ کۆکییان لەسەر زۆر شت، چجای ئەوەی لە چەند ژینگە و کولتووری جیاوازدا بێت، بێ گومان جیاوازییەکە زیاتر دەبێت.

ئەگەر دروست بێت قسە لەسەر جیاوازیی ڕۆژئاواییەکان بکرێت لە هونەر و بیردۆزەکانی، لە ڕووی بنیات و ناوەرۆك کە لەناو یەك میللەتدایە، ئەوە باسکردنی جیاوازیی میللەتێك لەگەڵ میللەتانی دیکە لە تێڕوانینیان بۆ بیدۆزەکە شیاوترە و دروستترە، ئەوەش باسەکە بەرەو قسەکردن دەبات دەربارەی بەرهەمەکانی شارستانیەتی ئیسلامی و دەرخستنی تایبەتمەندییەکانی لە بواری هونەر و جوانیدا.

شتێکی زانراوە کە گەشەپێدان بە گشتی پێویستی بە داهێنان و هەوڵدان و تێڕوانین هەیە، لەبەر ئەوە هیچ گەشەپێدانێکی ڕاستەقینە کە ڕەهەندێکی هونەری و بەهایی هەبێت، لەژێر سێبەری لاساییکردنەوە و دووبارەکردنەوەی بەرهەمی ڕۆژئاوایی لە بواری هونەردا، بە ناوی جیهانیەتی هونەر، بە بێ ڕەخنەگرتن و لێکۆڵینەوە وێنا ناکرێت.

لێرەدا ڕەخنە ڕووبەڕووی ئەو وتە و لێکدانەوە دەبێتەوە کە هەندێك توێژەر دەریدەخەن و پەنای بۆ دەبەن، کە ڕەخنە لە جوانییەکانی ئیسلامی دەگرن بەوەی کە پەیوەندی دروست دەکات لە نێوان بەها هونەرییەکان و بەها ڕەوشتییەکان (ئەخلاقییەکان)، یان فراوانکردنی چەمکی جوانی بۆ ئەوەی بازنەی تەکنیکەکان و ئامرازە هونەرییەکان تێپەڕێنی و بازنەی ئەخلاق و ڕەفتار و ئەتێکیت لەخۆ بگرێت، کە قورئان پێشەنگ بووە لە وەسفکردنی بەها ئەخلاقییەکان و کارە کۆمەڵایەتییەکان بە وەسفی جوانی، وەکو: ئارامگری (صبر)؛ ( وَجَاءُوا عَلَى قَمِيصِهِ بِدَمٍ كَذِبٍ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ

أَنْفُسُكُمْ أَمْرًا فَصَبْرٌ جَمِيلٌ و اللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ) [يوسف:١٨] جێهێشتن (هجر) (وَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ و اهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا) [المزمل: ١٠] ، تەڵاقدان (تسريح)، هەر وەکو لەو ئایەتەدا هاتووە (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ و سَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ) [الاحزاب: ٤٩]

ئەم جۆرە ڕەخنانە لە هونەر و جوانیی ئیسلامی، لەسەر بنەمای لاساییکردنەوەی هونەر و بواری جوانیی ڕۆژئاواییی دامەزراوە، ئەو دیدە ڕۆژئاواییەی کە تێکەڵکردنی جوانی و ئەخلاق بە ناشیرین دادەنێت، کە چی نەریتی ڕەخنەیی (العرف النقدي) وا دەخوازێت هەر ژینگەیەك تایبەتمەندیی ڕەخنەیی و هونەری و جوانیی خۆی هەبێت، بۆیە شتێکی هەڵە نییە شارستانیەتی ئیسلامی هەوڵی تێکهەڵکێشکردنی جوانی و ئەخلاق بدات، بەڵکوو عەیب و هەڵە ئەوەیە ئەو تێکهەڵکێشکردنە بە ناشیرین دابنرێت.

ڕەخنەگران ئەو تێکەڵکردنە لە نێوان جوانی و ئەخلاق، بە هەڵبەستراوێکی نوێی ئەم سەردەمە دادەنێن، کەچی ئاگادار نین کە تایبەتمەندیی تێکهەڵکێشکردنی جوانی و ئەخلاق، سەرچاوەکەی لە قورئاندایە و زانایان لە کۆنەوە باسیان لێکردووە و شییانکردووەتەوە، ابن القیم لەوبارەیەوە دەڵێ:"اعلم أن الجمال ينقسم قسمين ظاهر وباطن فالجمال الباطن هو المحبوب لذاته وهو جمال العلم والعقل والجود والعفة والشجاعة وهذا الجمال الباطن هو محل نظر الله من عبده وموضع محبته" جوانی دابەش دەبێت بەسەر دوو بەش: بەشی ڕواڵەت و دیار و بەشی پەنهان، جوانیی پەنهان لەبەر خودی خۆی خۆشەویستە و ویستراوە، کە بریتییە لە جوانیی زانست و

عەقڵ و بەخشین و پاکی و ئازایەتی... هتد، ئەو جوانییەیە کە جێی تێبینی و ڕەچاوکردن و خۆشەویستیی خوایە (سبحانه).

پاشان لە ڕاڤەکردنی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ،((ان الله جميل يحب الجمال)) ئاماژە بە فراوانیی ئەو جوانییە دەکات کە خوای گەورە بە جوانی دەناسرێت، ئەو جوانییەی ((هاوشێوەی نییە لە هیچ شتێك و دەپەرسترێت بەو جوانییەی کە خۆشی دەوێ لە وتە و کردار و ڕەفتار. پێی خۆشە بەندەکەی، زمانی جوان بکات بە ڕاستگۆیی و دڵی بە دڵسۆزی (اخلاص) و خۆشەویستی و پاڕانەوە و پشت پێ بەستن، ئەندامەکانی بە خواپەرستی و جەستەی بە دەرخستنی نیعمەتەکانی خوا لەسەری لە جلوبەرگ و پاککردنەوەی لە پیسی... کە وابێ دەیناسێت بە سیفاتی جوانی و خۆی پێ دەناسێنێت بە کردار و وتە و ڕەفتاری جوان، دەیناسێ بە جوانی کە سیفەتیەتی و دەیپەرستێ بە جوانی کە شەرع و ئاینیەتی)).[٧٧]

ئەو تێکهەلکێشانە لە نێوان جوانی و ڕەفتار، جوانیی کردووە بە سەرچاوە و ئامراز و مەبەست، بووەتە سیفەتی پەرستراو (خوا سبحانه)، هەروەها سیفەتی بەندە و دروشمەکانی پەرستش، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە قورئان بە ڕێنماییە بەرزەکانی، وەرچەرخانێکی لە هزر و عەقڵی مرۆڤایەتی بەرانبەر جوانی دروست کرد، لە ڕووی سروشت و ئەرك و بوارەوە، کە هیچ شارستانیەتێك نەیتوانیوە لە واقیعی ژیان دا جێبەجێی بکات، ئاشکراترین بەڵگەش ئەوەیە هونەر و ڕەخنەی سەردەم تا ئێستاش – لەسەر زمانی شوێنکەوتووانی– جیاوازی لە نێوان جوانی و ئەخلاقدا لە ڕووی

[٧٧] روضة المحبين و نزهة المشتاقين، لا: ٢٢١

سروشت و لێکۆڵینەوەوە دەکات، بەڵکوو دەیەوێت ئەو بارە بکاتە پێوەرێك بۆ بڕیاردان.

بیردۆزەی هونەر لە ڕۆژئاوادا، لە ڕاستیدا کۆمەڵێك بیردۆزەن بە لاسایی و گواستنەوە دەستپێدەکات، پاشان (انطباعیة) و واقیعیەت و سریالی وشەکلی و نوێگەری و دوای نوێگەری، ئەو بیردۆزانە یەك لە دوای یەك لەسەر بنەمای سڕینەوە و تایبەت کردن و گشتی کردن و ڕەهایین، ئەو جیاوازییە پەیوەندیی بە تێپەڕاندنی کەموکووڕییەکان و بەدیهێنانی ئارەزووی گەیشتنە بە تەواوی (الکمال)، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر بوونی جیاوازی لە دیدی ڕۆژئاوادا.

لە ڕووانگەی ڕەتکردنەوەی (جیهانیەتی بیردۆزەی هونەر) و جەخت کردنەوە لەسەر کاریگەریی کولتوور و شارستانیەتی میللەتان لەسەر هونەر و بەرهەمی هونەری، بەشێك لە بیرمەندانی ئیسلامی هەوڵیان دا بۆ پێشنیارکردنی پرۆژەی بیردۆزی هونەری ئیسلامی و بەشداریکردن لە گەڵالەکردنی چەمکەکانی و ئاراستەی، بە پشتبەستن بە دەقەکانی قورئان و سوننەت و بەرهەمی هونەرمەندان و ڕۆشنبیران، لەژێر سێبەری شارستانیەتی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە ئەزموونی میللەتان کە تێکەڵ بە شارستانیەتی ئیسلامی بوون، ئەوەش هونەرێکی دەرخست کە هەڵگری یەکایەتی و جۆرایەتی و ڕەسەنایەتی و نوێکاری و مۆرکی ناوچایەتی و ئیسلامیی پێوەیە.

## بەربەستە ناوخۆییەکان

١- بانگەشەی هەبوونی بیردۆزیکی ئیسلامی بۆ هونەر:

حەماسەت و ئارەزوو، پاڵی بە هەندێ بیرمەندی ئیسلامییەوە نا کە بانگەشەی هەبوونی بیردۆزەیەکی هونەری ئیسلامی بکەن، بە بەڵگەی هەبوونی بەرهەمی شارستانیی موسڵمانان لە بوارەکانی شیعر و هونەرە دەنگییەکان و مۆسیقاو و زەخرەفە و تەلارسازی و هونەری دیکەش لە هونەرە بیستراوەکان و بینراوەکان و دەستییەکان، هەندێك ڕۆژهەڵاتناسیش پشتگیرییان لەو بیرۆکەیە کردووە، وەکو: ارنست کونیل[٧٨]، جورج مارسیە[٧٩]، جاك بیرك[٨٠]، هەرچەندە شیکردنەوەی زانستی، پشت بە ژمارە و مەنهەجیەت دەبەستێت، نەك حەماسەت و ئارەزوو.

پێویستە جیاوازی لە نێوان دید و بیردۆزە بکەین، دیدی ئیسلام بۆ هونەر بوونی هەیە و کەسێك ناتوانێت نکووڵیی لێ بکات، بەڵام بۆ ئەوەی ببێتە بیردۆزە، پێویستی بە بنیاتنانی فەلسەفی و مەنهەجیەت و چەمك هەیە.

لە ڕاستیدا تا ئێستاش لێکۆڵینەوە لە هونەر و جوانی لە بازنەی ئیسلامدا، لە هەنگاوە سەرەتاییەکانیدایە، لە هەندێ بنەما تێپەڕی نەکردووە، وەکو: جوانی سیفەتێکی جێگیرە لە پێکهاتەکانی بوونەوەر و سروشت، قورئان جوانی بە بەهایەکی نایاب دادەنێت لە بەهاکانی سوود و

---

[٧٨] ارنست کویل، Ernst Kühnel، (١٨٨٣-١٩٦٤م) ڕۆژهەڵاتناسێکی ئەڵمانییە، لە بەرهەمەکانی: «من الخطوط الإسلامیة» و «الفن الإسلامي».

[٧٩] جورج مارسیە G.Marsais (١٨٧٦- ١٩٦٢م)، ڕۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسییە، لە بەرهەمەکانی: بلاد المغرب و علاقتها بالمشرق الاسلامي في العصور الوسطى.

[٨٠] جاك بیرك Jacques Berque، (١٩١٠ - ١٩٩٥ م) ڕۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسییە، لە زانکۆی جەزائیر و سۆربۆن خوێندوویەتی، لە بەرهەمەکانی: (الشرق الثاني) ، (الإسلام يتحدى) (ترجمة معاني القرآن الكريم).

ئەرك (المنفعة و الوظيفة)، شێوازی قورئان گەیشتووەتە پلەی ئیعجاز لە ئاستی هونەری و جوانیدا.

لەگەڵ گرنگیی ئەو بنەمایانە، بەڵام بیردۆزەی جوانیی هونەری، بنیاتنانێکی تۆکمەیەلە وێناکردنی زاراوەکان و ئامرازەکانی شیکردنەوە و پێوان، بنیاتنانێکی دامەزراوە لەسەر وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە:

١- سروشتی چێژی هونەر و سۆز و ویژدان چییە؟

٢- ڕاستیی توانای خەیاڵ و چێژوەرگرتن لە لایەن داهێنەر و وەرگر (متلقی) چییە؟

٣- کرداری چێژوەرگرتن لە جوانی چۆن دەبێت؟ ئەو ڕەگەزانەی کاری تێدەکەن چین؟

٤- ئایا تێگەیشتنی جوانی و هونەری، تێگەیشتنێکە لە ناخی بابەتی جوانیدایە؟ یان پەیوەندیی لە ڕووی بەرزبوونەوە و گەشەکردن و بەرەوپێشچوون بە سروشتی وەرگر (المتلقی) و ڕۆشنبیری و تێڕوانینی هەیە؟

٥- هیچ پێوەرێکی جێگیر بەدەر لە کات و شوێن (الزمان و المکان) بۆ دیاریکردنی بەهای هونەر و جوانی هەیە؟ یان ڕێژەیی و جۆرایەتی بڕیاری لەسەر دەدەن؟

٦- ئایا جوانی یەك جوانییە؟ ماددییە یان واتاییە؟

٧- سروشتی شارەزایی (خبرەی) جوانی چییە؟ سەرچاوەکانی چین؟ کرداری ئاراستەکردنی چۆن دەبێت؟

٨- شتێکی حەتمییە کە شارەزایی (خبرە) لە جوانیدا لای موسڵمانان یەك بخرێت، لەبەر یەکبوونی بیروباوەڕ و وێناکردن و دیدیان؟ یان جیاوازی

کارێکی ڕەوایە و دروستە؟ ئایا جوانی دەکرێت پێوەر بکرێت؟ ئایا ئامرازەکانی پێوەرکردنی لەناو دەروون و کۆمەڵگەدا چین؟

٩- هونەر فراوان دەبێت بە فراوان بوونی ژیان؟ جۆراوجۆر دەبێت بە جۆراوجۆریی دیاردەکان؟ یان بوونەوەرێکی تەواو نەگۆڕە لەسەر یەك بار جێگیرە؟

١٠-چۆن بەهای هونەری ئیسلامی دیاری دەکرێت، بە ڕوانین بۆ وەرگرەکان (المتلقین)؟

١١-ئایا هونەری ئیسلامی دوورە لە کاریگەرییە کۆمەڵایتییەکان، یان ڕەنگدانەوەیەتی و دیاردەیەکە لە دیاردەکانی؟

١٢-ڕۆڵی هونەری ئیسلامی لە گەشەپێدانی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا چییە، ئایا دەچێتە ناو ئەو گەشەپێدانە، یان بەرزە لە تێوەگلانی، لەبەر ئەوەی سروشتی هونەر بەرزە لە سوود و ئەرك؟

١٣- ئایا بەرهەمی هونەری ئیسلامی بە بەهای بازاڕ و خستنەڕووی داواکاری، بەها دەکریێ؟

١٤-ئایا پەیوەندیی نێوان عەقڵی شەرعی و عەقڵی هونەری، پەیوەندییەکی پشتگیری کردن و تەواوکارییە؟ یان پەیوەندییەکی شوێنکەوتن و ملکەچ بوون و کۆپییە؟

١٥-دواڕۆژی هونەری ئیسلامی لە سایەی ئەو گۆڕانکارییانەی لە ئەنجامی فەلسەفەی جیهانگیری (العولمة) سەری هەڵداوە، چییە؟

بەرهەمی ڕەخنەی هاوچەرخی ئیسلامی، نەگەیشتووەتە ئاسۆی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە، مەگەر چەند ئاماژەیەك نەبێت لێرەولەوێ، بەڵام هونەر و جوانیی ئیسلامی، پێویستی بە نوێکردنەوەی تێگەیشتن و

بنیاتنانی بیردۆزە و ڕەخنە هەیە، گەیشتن بەو بیردۆزەیەش پێویستی بەم ئاراستانە هەیە:

أ- کۆکردنەوەی ئەو ئایەتانەی پەیوەندییان بە بواری هونەرەوە هەیە و لادانی ئەو ڕاڤە لاوازانەی بۆیان کراون و کۆکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ کە بەڵگەن لەسەر هونەرەکان لە ڕووی حەرامی و مەکرووهی و حەڵاڵییەوە، وە دەرخستنی پلەی دروستی و سنووری ڕاشکاوی (صراحە) واتای دەقەکان لەسەر هەلوێستی بەرانبەر هونەرەکان.

ب- کۆکردنەوەی بیروڕا پەیوەندیدارەکان بە دیاردەی جوانی، لە کولتووری ئیسلامی لە لایەن شاعیران و ڕەوانبێژان و هونەرمەندان و دەرونزانان و شەرعزانان و پزیشکان و زانایان، لە دوای کۆکردنەوەی ئەو ئایەت و فەرموودانەی پەیوەندییان بە بابەتی هونەرەوە هەیە، گەڕان بە دوای دیاردە و پەیوەندییەکانی نێوان دەقە فەلسەفی و ڕەوانبێژی و زانستی و بەرهەمە هونەرییەکان، بۆ دۆزینەوەی خاڵی هاوبەش و یەکهزرییەکەی پشت گشت دیاردە هونەرییەکان، هەرچەندە ئامرازەکانی دەربڕین و جێبەجێکردنی جیاواز بن.

ج- ئەنجامدانی ڕوانینێکی وردی بەرهەمی مرۆڤ لە بواری هونەر و جوانی، بۆ ناسینی بەرهەمە ڕەسەنەکانی هاوتا و گونجاو لەگەڵ فریشك (فطرة) و دوورخستنەوەی ئەو بەرهەمانەی لایانداوە لە جوانی و گەشەکردنی جوانی.

د- کۆکردنەوەی زانایان و شەرعزانان و پسپۆران لە کۆڕی زانستیدا، بۆ لێکۆڵینەوە و ڕێنمایی کردن و داڕشتنی ڕێسای ڕێنمایدەر بۆ موسڵمانان لە بواری هونەر و جوانیدا. نوێکردنەوەی پەیوەندیی موسڵمان بە هونەر و جوانی، بۆ گواستنەوەی لە باری ترسان و نەفرەتکردنەوە، بۆ باری وەرگرتن

و وەبەرهێنانی هونـەر، بـە ئامـانجی فراوانکردنـی بوارەکـانی خواپەرسـتی و چاکسازی.

هـ- ترازاندنی پەیوەندیی مێژوویی نێوان هونەرەکان و ژینگە سـۆفیگەری و فەلـسەفی و کۆمەڵایەتییـەکان، چـوونکە بەرهـەمی تیـۆری و پیـادەکردنی پراکتیکیی هونەرە ئیسلامییەکان، لە سێبەری شارسـتانیەتی ئیـسلامیدا لـە سێ ڕووەوە ڕووبەڕووی زێدەڕۆیی (تطرف) بووەتەوە:

١- ئەو زێدەڕۆییەی لە لایەنی ئەو فەلـسەفانەوە تووشـی هـاتووە، کـە دوورن لــە ئیــسلام و بنــەماکانی، هەرچــەندە لــە نووســینی فەیلەســوفە موسڵمانەکان، تێڕوانین و هەڵوێستی جوان و ورد و بە بەهای لەخۆ گرتـووە، بەڵام زۆر جـار تێکـەڵ بـووە بـە دیـدی فەلـسەفەی ئـاڵۆز و دوور لـە فریـشك (فطـرة) کـە عـەقڵی موسـڵمانان قـەبووڵی ناکـات، بۆیـە پێویـستە بەرهـەمی فەلسەفی ببێژرێ بۆ سوود وەرگرتن لە هزر و هەڵوێستە بـە بـەها و هاوتاکـان لەگەڵ ئیسلامدا و دوورخستنەوەی ئـەو هـزر و هەڵوێـستانەی فەلـسەفەکانی دیکە کە تێکەڵی بوون.

٢- زێـدەڕۆیی و لادانـی هەنـدێ گرووپـی سـۆفیگەری لـە مامەڵـەکردنیان لەگەڵ هونەرەکان، کە کاریگەریی لە هەڵوێستی بەشێکی موسڵمانان بەرانبەر بە هونەر کـردووە، کرانـەوەی هەنـدێ گرووپـی سـۆفیگەری بەسـەر هونـەرە بیستراوەکاندا (گۆرانی و مۆسیقا و سەما)، بووەتە هۆی ئـەوەی کـە زەیـنی زۆرێك لە موسڵمانان بۆ حەرامیی هونەر بڕوات و کەڵك لە بەرهەمی (تصوف) وەرنەگرن، کە لە هـزری سـۆفیگەریدا زۆرێـك لـە واتـای جـوانی و هونـەری و ڕەوانبێژی و ڕۆحی هەن، کە سوودی زۆریان لە بواری هونـەردا هەیـە، بـەڵام

لەگەڵ تێبینیی پاککردنەوەی لە هەر شتێك پێچەوانەی پاکی و بێگەردیی بیروباوەڕی ئیسلامی بێت.

٣- زێدەڕۆیی و لادانی ژیانی کۆمەڵایەتی، بەرەو ئاراستەی خزاندنی هونەر بۆ ناو جیهانەکانی بەدڕەوشتی و نائەخلاقی، کە ئەوەش لە کتێبە مێژووییەکاندا تۆمار کراوە.

زۆر جار کۆڕی هونەر و جوانییەکان تێکەڵ دەبوون لەگەڵ ئاراستەی چەند ڕەفتارێکی وەکو: مەیخواردنەوە و سەما و ڕابواردن، ئەوەش ئەوەی لە بیری موسڵماناندا جێگیر کرد کە پەیوەندییەکی بەردەوام لە نێوان هونەر و ئەو جۆرە ڕەفتارە نەشیاوانەدا هەیە، بەڵام ئەوە وێناکردنێکی دروست نییە، چوونکە ئەو وێناکردنە دەبێتە هۆی ئەوەی بیرکردنەوە لە لێکترازاندنی هونەر لە بوارە بەدڕەوشتییەکان، مەحاڵ بێت.

و- جێبەجێکردنی خوێندنەوەیەك لەژێر ڕۆشنایی مەبەستەکانی شەرع، بۆ ئەو دەقانەی پەیوەندیدارن بە هونەر و جوانییەکان، کە لایەنی ناپەسندی (مکروه) و حەرامی و ڕەتکردنەویان زاڵ کردووە، ئەو فەتوایانەی کە زیاتر پشتیان بە (سد الذرائع) و پێشلێگرتن بەستووە، ئەوەش بووەتە هۆکارێك بۆ دوورکەوتنەوەی موسڵمانان لە هونەرەکان، بە مەبەستی دوورکەوتنەوەیان لە فیتنە و گومڕایی شەیتان، تا وای لە زانایەکی وەکو ئیمامی شافیعی کردووە بڵێ: ((ولولا الشعر يزري بالعلماء ... لكنت اليوم أشعر من لبيد)) واتە: ئەگەر شیعر زانایانی لەکەدار نەکردبا، ئەمڕۆ لە لبید شاعرتر دەبووم.

ئەو هونەرەی لێرەدا لە بەهای زانایانی کەمکردووەتەوە، هونەری شیعر بووە، کە یەکەم هونەر بووە موسڵمانان تەرخانیان کردووە بۆ دەربڕینی

هەست و باوەڕ و دیدە جوانەکانیان بۆ ژیان و بوونەوەر، چجای هونەری گۆرانی و مۆسیقا و وێنەکێشان.

بۆیە پێویستە توێژەران لێکۆڵینەوە لەو بابەتانە بکەن، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ترازاندنی بارودۆخی خودی و مێژووی و کۆمەڵایەتی و شارستانیەتی، توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیەکی نوێ کە ڕەچاوی سنووری حەڵاڵ و حەرام و ناپەسەندی (مکروە) بکات، هەروەها ڕەچاوی سروشتی دەقی تایبەت و گشتی بکات، فەرموودە و کردەوەکانی پێغەمبەر کە تەشریعن، جیابکاتەوە لەوانەی کە تەشریع نین، لەژێر ڕۆشنایی مەبەستەکانی شەریعەتدا بێت.

زەمینەی ئیسلامی لەبارە بۆ داهێنانی هونەر و جوانی، یەکێك لە کێشەکانی بەردەم دامەزراندنی بیردۆزەی جوانیی ئیسلامی و بەدیهێنانی لە هونەرەکان، پەیوەندیی بە تێگەیشتنی هەڵوێستی ئیسلام بەرانبەر بەها جوانی و هونەرییەکانەوە هەیە، تێگەیشتنی ورد بۆ ئەو بابەتە، ڕێگرییەکان لادەبات لەسەر ڕێی ویژدانی موسڵمان، وا دەکات بەرەو داهێنان هەنگاو بنێت، کە بەرزترین و جوانترین هونەر بە درێژایی مێژوو بەرهەم دێنێت.

خەریکبوون بە یەکلاییکردنەوەی ئەو باسەوە، لە کارە لەپێشینەکانە (اولویات)، ئەگەر نا قەیرانی موسڵمانان بەردەوام دەبێت. لە سەردەمێك کە شەپۆلی هونەر و ئەدەب جیهانی گرتووەتەوە، کە لە ماوەیەکی کەمدا داهێنانێکی نوێ لە ئامرازەکانی دەربڕینی جوانی و هونەردا دەکرێت، کە ئامرازێکن کاریگەریی مسۆگەریان لە سڕینەوەی بەهاکان و ڕەتکردنەوەی ئەو فریشکەی (فطرة) کە مرۆڤی لەسەر خەلق کراوە، هەیە و کاریگەرییان لەسەر جووڵە و بێ جووڵەیی کۆمەڵگا دەبێت، لە ئەنجامدا ئەو هونەرانە

باوەش لە مرۆڤ دەگرن و دای دەبڕێنن لە دەنگی ئـایین و بـەهاکان، بـەڵکوو دیندارانیش لەوانەیـە خۆیـان بـە گۆشـەگیری ببیننـەوە لـە کۆمەڵگایـەك کـە هونەرەکان بووەتە ناسنامە و خواردن و خواردنەوە و ئەو هەوایەی هەناسەی پێ دەدەن.

ز– لێکۆڵینەوە لەلایەن توێژەرانەوە لەو حوکم و بڕیارانەی پەیوەندیدارن بــە هونــەری ئیــسلامییەوە، موســڵمان بــن، یــان ڕۆژهــەڵاتناس. پاشــان لێکۆڵینەوە لە سـنووره زانـستییە دروسـتەکانی و ڕەخنـەگرتن لـەو حـوکم و بڕیارانەی لەبارەی ئەو هونەرانـەوە دەردەچـن لـە ڕووی سروشـت و ئـامراز و ئەرکەوە.

ح– دارشتن و پێشنیارکردنی مەنهەجێکی تیۆری و پراکتیکی، بـۆ دانـانی بابەتی هونەرە ئیسلامییەکان لە پرۆگرامی خوێندنی پەیمانگا و و کۆلێژەکان و بەشــەکانی ئــاداب و خوێنــدنی ئیــسلامی و کۆلێــژەکانی ئەنــدازیاری و تەلارسازی و پەیمانگاکانی هونەری سەردەم.

٢– بانگەشەی تایبەتکردنی فەتوای هونەری بە شارەزایانی شەرع:

ئەو وتەیە واتاکەی ئەوەیە کە دەبێ تەنیا زانایانی شەرع، حەڵاڵ و حەرام لە بواری هونەر و ئەدەبدا یەکلابکەنەوە.

ئەم وتەیە ڕاستە، بەڵام پێویستی بە خستنەسەرە، کـە فـەتوای هونـەری دەبێ لەگەڵ زانایانی شەرع و پسپۆڕان و شارەزایانی بوارەکانی دەروونزانـی و کۆمەڵناسی و زانستی جوانی (علم الجمال) و هونەر بەشدار بن، هەر وەکـو بوارەکـانی بزیـشکی و ئـابووری و فەلەکناسـی، کـە زانایـانی شـەرع لەگـەڵ شــارەزایانی ئــەو بوارانــە کۆدەبنــەوە بــۆ دەرخــستنی هەڵوێــستی شــەرع دەربارەی بابەتەکان بە ڕوونی و وردی.

بەشـداری کردنـی زانایـانی جـوانی و دەروونـزان لـە دەرکردنـی فـەتوای شەرعی، ئەوە ناگەیەنێت کە زانایانی شـەرع پـەراوێز بخـرێن، بـەڵکوو ئـەوە بانگەوازێکــە و ڕێگایەکــە بــۆ ئــەوەی فیقهــی هونــەری و فیقهــی جــوانی دابمــەزرێت، فــەتواکانی هونــەری زۆربــەی هــەلقولآوی ژینگــەی دەروونــی و کۆمەڵایەتیی سەردەمەکانی پێشوو بوون، کە ڕێگە بە هەندێ هونەر نەدراوە لــە ســنووری حەســاندنەوەی دەروون و نوێکردنــەوەی چــالاکی و هەوڵــدان دەربچێت، لەگەڵ ئاگادارکردنەوەی موسڵمانان لـە بـەفیڕۆدانی کاتـەکانیان، لەگەڵ تێبینیی ئەوەی کە هونەر لە سەردەمەکانی پێشوودا کارێکی تایبـەت بووە بە تاکەکان، نەبووەتە بنیاتنانێکی دەروونی و ڕەفتاری کە بودجەیەکی زۆری بۆ تەرخان بکرێ و لە پلان و بەرنامەی و لآتان و دەزگاکان دابنرێ، بۆ ئاراستەکردنی خەڵك و کۆمەڵگا و بڵاوکردنەوەی بەهاکان.

د. المكي اقلانيـة دەڵـێ: "ئەگـەر گـۆرانی و مۆسـیقا حـەڵاڵ بکـەین بـەو مەرجانەی دانراون، بەڵام بەردەوامبوون لەسەری بە شێوەیەك ببێتە نەریت و خووی پێوە بگیرێت، ئەوە بە باش دانانرێت، بەڵکوو گـوێلێگرتنی تـەنیا بـۆ بارسووککردنی دەروون و دەستپێکردنەوەی کارەکان لە نوێوە بێت، یان بـۆ دەربـڕینی خۆشـی لـە بۆنـە شـەرعییەکاندا بێـت. پێویستیـشە بـەهای کـات بزانرێت، چـوونکە جـوان بـەکارهێنانی کـات میللـەتان بـەرەو پـێش دەبـات، کۆمەڵگە ئیسلامییەکان لەو سەردەمەدا زیاتر پێویستیان بە کـەڵك وەرگـرتن هەیە لە کات، بۆ ئەوەی هەر بە پاشکۆیی نەمێننەوە".[81]

تێبینیی ئەوە دەکەین کە مەبەستی گـوێگرتن لـە هونـەرە دەنگییـەکان، تەنیا لە حەسانەوە و سـووکردنی بـاری دەروونیـدا کورتکراوەتـەوە، کەچـی

---

[81] الفن والموسیقی بين الاباحة و التحريم، لا: ٩٤.

مەبەستی زۆر گرنگ هەن دەکرێ لە ڕێگای هونەرەوە بەدی بهێندرێن، وەکو: پــەروەردەکردن و فێرکــردن و ئاراســتەکردنی ویــژدان و بڵاوکردنــەوەی بەهاکان... هتد. جگە لەوەی ڕۆژئاواییەکان کاتی زۆریان تەرخان کردووە بۆ هونــەر و داهێنــان و جوانکــاری لــە هونــەردا، پــەیمانگا و دەزگایــان بــۆ دامەزراندووە و کۆڕبەند و کۆنفرانسیان بۆ بەستووە و بەخشین و خـەڵاتیان بۆ تەرخان کردووە، کەچی لە زانستیشدا پێشکەوتوون و ئـەو گرنگیدانـەیان نەبووەتە ڕێگر لە پێشکەوتنی زانستییاندا.

بەستنەوەی هونەر بە کاتبەفیرۆدانەوە، پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە، وا دەردەکـەوێ کـە ئـەوەش ئـەنجامی تێڕوانینـە بـۆ هونـەر وەك بابـەتێکی تایبەت بە تاکەکان، هەروەها کورتکردنەوەی مەبەستی هونەر لە حەسانەوە و خۆشیی دڵ و دەروون و نوێکردنەوەی چالاکی، کـە ئەمـەش پێویـستی بـە هەڵوێستە لەسەر کـردن هەیـە، چـوونکە ئـەو تێگەیـشتنە هـەڵقولاوی دەق و مەبەسـتە شـەرعییەکان نییـە، بـەڵکوو تـەنیا دووبارەکردنـەوەی وتـەی ئـەو زانایانەیە کە گوزارشتیان لە ژینگەی سەردەمی خۆیان کردووە.

هونەر، وەکو زێـدەڕۆیی و ڕابواردنێـك لـە ژیـانی مرۆڤـدا و تایبەتمەنـدیی چینێکی خۆشگوزەران و بێ کار نەماوەتەوە، وەکو لای هەنـدێ کـەس و لـە هەنـدێ قۆناغـەکانی مێـژوودا وا تەماشـا کـراوە، بـەڵکوو ئـەمڕۆ هونــەر پێکهاتەیـەکی سـەرەکییە لـە پێکهاتـەکانی مرۆڤـی دروسـت و ئـامرازێکی کاریگەرە بۆ بەدەستهێنانی زانیارییەکان و یەکێکە لە پێویستییەکانی ژیان و پێشکەوتن لە ژیانی مرۆڤدا.[82]

[82] الاسلام و الفنون الجميلة، لا: ١٤٨.

تا ئێستاش زۆرێك لە زانایان و پسپۆڕانی شەرع، وەكو بابـەتێكی تایبـەت بە تاكەكانی خەڵك سەیری هونـەر و جوانییـەكان دەكـەن، تـا ئێـستاش بـەو شێوە سەیری هونەر دەكرێ كە بابەتێكە مرۆڤ جارێك یان چەند جارێكی كەم لە ژیانیدا دێتە پێشی، ئاوڕ بـۆ ئـەوە نادەنـەوە كـە هونـەر لـەم سـەردەمەدا بووەتە سیما و زمان و ئامرازێكی سەردەم و دیاردەیەكە كە لە ژیـانی تـاك و كۆمەڵگادا بە گشت توێژەكانیەوە، زۆر زەق و دیارە.

٣- بانگەشـــەی ڕەتكردنـــەوەی پەیكەرتاشـــی لەلایـــەن هونـــەری ئیسلامییەوە، لەبەر لایەنی بیروباوەڕ:

لای زۆرێك لە توێژەرانی هونـەری ئیـسلامی و زانایـانی فیقهـی ئیـسلامی، هونـــەری ئیـــسلامی پەیكەرتاشـــی (تجـسیم) ڕەتدەكاتـــەوە، ئـــەوەش بـــە حوكمێكی بەڵگەنەویست دادەنێن كە گشت دەربڕینێك بە شێوەی جەستەیی و ســێڕەهەندیی گیانلەبــەران دووردەخاتــەوە، لــەجیاتی ئــەوە شــێوازی تەجریــدی و هێمــایی هەڵبــژاردووە بــۆ ئــەوەی نەبێتــە لاســاییكردنەوە و پێچوواندنی دروستكراوەكانی خوای گەورە، كە دروستكردن و بـەدیهێنان لـە تایبەتمەندییەكانی خوایـە، چـوونكە پـەیكەرتاشـیی گیانلەبـەران، بتپەرسـتی دێنێتەوە بیری خـەڵك. محەممـەد قوتـب دەڵـێ: "پـەیكەرتاشـی و سـەمامان دوورخـستەوە لـە بازنـەی شـیكردنەوەی هونـەری ئیـسلامی، بـەو سـیفەتەی دربڕینێكە تەنیا لە ڕێگای جەستەدایە، ئەوەش مەرجەكانی هونەری ئیسلامی لێ نایەتەدی"[٨٣]. تا ئەو ڕادەی هەندێ هونەرمەنـد كـە هـەوڵیان دا ڕەگـەزی مرۆڤ و گیانلەبەران لە هونەرەكانیانـدا وێنـە بكـەن، بـە شـێوەیەكی تایبـەت وێنەیان كرد، كە دەرچووبێت لە پێچوواندن.

---

[٨٣] منهج الفن الاسلامي، لا: ١٣٦

لـه ئـەنجامی ئـەو جـۆرە تێڕوانینـە، هەنـدێ لاسـاییکردنەوەی واتـاییش ڕەتکرانــەوە، وەکــو ڕۆڵــی کەســایەتییە مێژووییــەکان و نموونــەی نــاو چیرۆکەکان، لە ڕێگای نواندن و شانۆوە.

دکتۆر (حسن الامرانی) دەڵێ: "مەبەست لە زارەوەی هونەری ئیسلامی، دوو شتە: ئەو هونەرەی بەرهەمی گەلە موسڵمانەکانە، پاشان ئەو هونـەرەی هەڵقوڵاوی بیروباوەڕی موسڵمانانە، ئـەو بیرووبـاوەڕەی هەنـدێ هونـەری زاڵ کـرد بەســەر هەنــدێکی دیکــەدا، خــەڵکی لــە پەیکەرتاشــی و وێنەکێــشان دوورکەوتنــەوە، بــە تایبــەتی وێنــە و پەیکــەری گیانلەبــەران، لــە بەرانبــەردا هەنــدێ هونــەر بــەرەو پــێش چــوون، وەکــو: خۆشنووســی، زەخرەفــە، تەلارسازی".[84]

ئەوانەی تێبینییان لەسەر ئەو تایبەتمەندییە هەیە و پێیان وایە پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە، ئەم پرسیارانە دەخەنە ڕوو:

١- چ بنامەیەکی زانستی هەیـە بـۆ گرێـدانی نێـوان هونـەری ئیـسلامی و بنەمای ڕەتکردنەوەی وێنەی مرۆڤ و گیانلەبەران و بەرجەستەکردنی؟

٢- ئایــا ڕەتکردنــەوەی پەیکەرتاشــی لــە هونــەری ئیــسلامیدا، بــە وردبوونەوە و بیرکردنەوە لە بوونەوەر و دیاردە سروشـتییەکان، پێـچەوانەی فەرمانی خوا نییـە لـە قورئـانی پـیرۆزدا؟ لـەو کاتـەی بیرکردنـەوە و ڕوانـین یەکەم هەنگاوە بۆ داڕشتنی بەرهەمی هونەری.

٣- ئایـا ئــەو فەرموودانــەی پەیکەرتاشــی و وێنــەکردن ڕەتدەکەنــەوە، ڕەچاوی هۆکار و مەبەستیان تێدا نەکراوە؟ کە خەڵکی ئەو کاتە نزیـك بـوون لە سەردەمی نەفامی و نەریتەکانیان بۆ پاراستنی بیروبـاوەڕ حـەرام کرابـوو،

---

[84] عوائق التنمية الفنية، لا: ٢٠٨.

که خەڵکی ئەو کاتە وێنەکردنی گیانلەبەریان تەنیا بۆ پەرستن و بە گەورە زانین بەکار دەهێنا، بەڵام کە خەڵکی دڵنیابوون لە کاریگەریی ئەم وێنانە لەسەر بیروباوەڕیان، ئایا حوکمەکەی ناگەڕێتەوە بۆ دروستی؟

لە لایەکی دیکەوە فەرموودەکان پەیوەندییان بە لاساییکردنەوەی خەلقی خواوە هەیە، کاتێك ئەو مەبەستە لە لای هونەرمەندی ئیسلامی نەما، ئایا داهێنان و جوانکاری و وێنەکردن کارێکی دروست نابێت؟

ئەو چەمکانەی لەگەڵ هونەری ڕۆژئاواییدان، وەکو ویستی هونەرمەند (وێنەکێش بێت، یان پەیکەرتاش) بۆ ڕکابەریکردنی توانای خوای گەورەو لاساییکردنەوەی دروستکراوەکانی خوا و سەلماندنی نەمری بۆ بەرهەمەکانی لە ڕووی هێزی ڕۆژگارەوە، یان پەرستنی سروشت لەجیاتی خوای گەورە، تایبەتن بە ژینگەی مرۆڤی ڕۆژئاوایی، مەرج نییە بگوازرێنەوە بۆ هونەرمەندی موسڵمان، یان لەژێر ڕۆشنایی چەمکەکانی هونەری ڕۆژئاوادا لێکدانەوە بۆ کارەکانی بکرێت.

ئەگەر پەیکەرتاشیی (مرۆڤ و گیانلەبەران) لە هونەری ئیسلامیدا جێگای نەبێتەوە، ئەوە کاریگەریی لەسەر دامەزراندنی بیردۆزی هونەری ئیسلامی نابێت، چوونکە دەکرێ شێوازی تایبەت و هێمایی بەکاربێت، هونەری ئیسلامییش ڕێڕەوی تایبەتی خۆی هەیە و بابەت و ڕەگەزی زۆر هەن تایبەتمەندییەکانی هونەری ئیسلامییان تێدا بەرجەستە بکرێت.

# باسی پێنجەم
# پەیوەندیی هونەری ئیسلامی
# بە مەبەستەکانی شەرعەوە

پێش ئەوەی پەیوەندیی نێوان هونەری ئیسلامی و مەبەستەکانی شەرع باس بکەین، پێویستە واتا و بەشەکانی مەبەستەکانی شەریعەت ڕوونبکەینەوە. مەبەستەکانی شەریعەت، بریتین لەو مەبەستانەی کە شەریعەت لە پێناو بەدیهێنانیدا دابەزێنراوە، ئەو مەبەستانەش بۆ بەرژەوەندیی مرۆڤەکانن.[٨٥]

## بەشەکانی مەبەستەکانی شەریعەت

مەبەستەکانی شەریعەت لە چەند ڕوویەکەوە دابەش دەکرێن:

لە ڕووی گشتگیری و تایبەتییەوە، بۆ سێ بەش دابەش دەبن:

یەکەم: مەبەستە گشتییەکان (المقاصد الكلية أو العامة): کە پێنج مەبەستە سەرەکییەکەن: پاراستنی ئایین و نەفس و عەقڵ و نەسەب و ماڵ.

[٨٥] المختصر الوجيز في مقاصد التشريع، لا: ١٩

دووەم: ئـــەو مەبەســـتانەی کـــە پەیوەنـــدییان بـــە بەشـــێکی تایبـــەتی حوکمەکانـەوە هەیـە (المقاصـد الخاصـة) ، یـان چـەند بەشـێکی پەیوەندیـدار، وەکو: مەبەستەکانی عیبادات، مەبەستەکانی معاملات، مەبەستەکانی خێزان.

سێیەم: مەبەستە جوزئییەکان (المقاصد الجزئیة): ئـەو مەبەسـتانەی کـە پەیوەنـدییان بـە هـەر یـەکێك لـە حوکمـە شـەرعییەکانەوە هەیـە، وەکـو: مەبەستەکانی نوێژ، مەبەسـتەکانی زەکـات، مەبەسـتەکانی هاوسـەرگیری... هتد، کە زۆرێك لە زانایان بە حیکمەت ناوی دەبەن.

لە ڕووی (قطعي وظني)یەوە دەبێتە سێ بەش:

یەکەم: مەبەستە قەتعییەکان (المقاصد القطعیـة): ئـەو مەبەسـتانەن کـە بەڵگە و دەقێکی زۆر دەیانسەلمێنن.

دووەم: مەبەستە زەننییەکان (المقاصد الظنیة): کە بەڵگەی (ظني)، یـان بیروڕای جیاوازیان لەسەرە.

سێیەم: مەبەستە وەهمییەکان (المقاصدا لوهمیة): ئـەو مەبەسـتانەی بـە ڕوواڵـەت وا دەبینـرێن کـە بەرژەوەنـدین و سـوودیان هەیـە، بـەڵام شـەرع ڕەتیکردووەتـەوە و دانـی پێـدا نـانێ، لـە لای زانایـان بـە بەرژەوەندییـە ڕەتکراوەکان ناودەنرێن.

لە ڕووی بەشی مکلف یان نەبوونی بەشی، دەکرێت بە دوو بەشەوە:

یەکـەم: مەبەسـتە ئەسـڵییەکان (المقاصـد الأصـلیة): کـە بەشـی مرۆڤـی (مکلف)ی لێ بەدی ناکرێ.

دووەم: مەبەسـتە پاشـکۆییەکان (المقاصـد التبعیـة): کـە بەشـی مرۆڤـی (مکلف)ی لێ دیارە و بەدی دەکرێ.[٨٦]

---

[٨٦] علم المقاصد الشرعیة، لا: ٧٥

## له ڕووی گرنگییەوە

زانایـانی شـەریعەت لـە ئـەنجامی بەدواداچـوونی حـوکم و فەرمانـەکانی شەرع، مەبەستەکانی شەریعەت بەپێی گرنگییان بەسەر سـێ بەشـدا دابـەش دەکەن:

١- زەرورەتەکان (الضروریات).

٢- پێویستییەکان (الحاجیات)

٣- جوانکارییەکان (التحسینیات)[٨٧]

شـەریعەت، گـشت لایەنـەکانی ژیـانی مـرۆڤ دەگرێتـەوە، بـە هـەموو وردەکارییەکانەوە، کە ئەوەش بڕیار و یاسایەکی زۆر لـەخۆ دەگـرێ، بـەلأم گشت ئـەو فـەرمان و بڕیـار و یاسـایانەی شـەریعەت بـۆ چـەند مەبەسـتێکی سەرەکی و گشتی دەگەڕێنەوە.

زەرورەتەکان (الضروریات) ئەوانەن کە نەبوونیان دەبێتە هۆی تێکـچوون و شـلەژانی سیـستەمی ژیـان و بلأوبوونـەوەی ئـاژاوە و نائـارامی، کـە کۆدەکرێنـەوە لـە پێـنج مەبەسـتی گـشتی و بـریتین لـە: پاراسـتنی ئـایین، پاراسـتنی خـودی مـرۆڤ، پاراسـتنی عـەقڵ، پاراسـتنی وەچـە یـان نەسـەب، پاراستنی ماڵ و سامان.

پێویستییەکان (الحاجیات) ئەوانەن کە پاراسـتنیان دەبێتـە هـۆی لادانـی ئازار و قورسی، نەبوونیشی نابێتە هۆی تێکـچوونی سیـستەمی ژیـان، بـەلأم خەڵکی لە ژیانیاندا ڕووبەڕووی ماندووبوون و ئازار دەبنەوە.

---

[٨٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا: ٧١.

جوانكارييەكان (التحسينيات) ئەوانەن كە پەيوەندييان بە ڕەچاوكردنی هەڵسوكەوت و ڕەوشتی بەرزەوە هەيە و ژيانی مرۆڤ تەواوتر و جوانتر دەكەن.

ئەم سێ پلەيە، بەپێی گرنگی ڕێكخراون، گرنگترينيان زەرورەتەكانن، پاشان پێويستييەكان و دواتر جوانكارييەكان.

شەريعەت ڕەچاوی هەر سێ پلەكەی كردووە و بڕيار و فەرمان و حوكمی بۆ بەديهێنانی هەر سێ پلەكە داناوە، هەروەها پاراستنی هەر پێنج مەبەستە گشتييەكانيش حوكم و بڕياری بۆ دەركراوە.

## پاراستنی پێنج مەبەستە شەرعييەكان

پێنج مەبەستە گشتييەكان، هەر وەكو پێشتريش باسمان كردا، بريتين لە: پاراستنی ئايين و نەفس و عەقڵ و نەسەب و سامان.

شەرع دوو ڕێگای بۆ پاراستنی ئەم پێنج مەبەستە گرتووتەبەر:

يەكەم: پاراستنيان لە ڕووی بوونەوە (حفظها من جانب الوجود)، واتە بەديهێنانی مەبەستەكە و دانانی بڕيار و حوكم بۆ هەبوونی، چوونكە پاراستنی هەر شتێك، وێنا ناكرێ ئەگەر بوونی نەبێ، هەبوونی هەر شتێكيش هەنگاوی يەكەم و سەرەكييە بۆ پاراستنی و بەردەوامی پێدانی.

دووەم: پاراستنی لە ڕێگای نەبوونەوە (حفظها من جانب العدم) واتە: بەردەوامی پێدانی مەبەستەكە لە دوای هەبوون و بەديهێنانی، ئەوەش لە ڕێگای ئەو حوكم و بڕيارە شەرعييانەی كە دەستەبەری بەردەوامبوونی مەبەستەكان دەكەن.[٨٨]

[٨٨] الموافقات، بەرگی: ٢، لا: ٦.

## مەبەستەكانی مكلف

لـە بەرانبـەر مەبەسـتەكانی شـەریعەت، مەبەسـتەكانی مكلـف هـەن، كـە بریتین لەو مەبەستانەی كە مكلف هەیەتی لە ئەنجامـدانی هـەر كردارێـك كـە بیروباوەڕ، یان وتە، یان كردار بێت، كە پێویستە مەبەسـتی مكلـف لـە هـەر كارێك، یەك بگرێتەوە لەگەڵ مەبەستی شەرع.[89]

## پێگەی هونەری ئیسلامی لە پەیژەی مەبەستە شەرعییەكاندا

پلەكانی مەبەستە شەرعییەكان لە سێ پایەدا كۆدەكرێنـەوە، كـە بـریتین لـە: زەرورەتـەكان و پێویـستییەكان و جوانكارییـەكان، ئـەو سـێ پایەیـەش بەپێی گرنگی ڕیزبەندی كراون.

لە ئەنجامی تێڕوانین لە سـنووری ئـەو مەبەسـتانە و ڕێـساكانیان، بۆمـان ڕووندەبێتەوە كـە پایـەی هونـەری ئیـسلامی لـەو ڕیزبەندییەكـەدا دەكەوێتـە پلەی جوانكارییەكان، ئەوەیش بەم بەڵگانەی خوارەوە:

١- پێناسـەی جوانكارییـەكان (التحـسینات) لەسـەر هونـەر جێبـەجێ دەبێت، چوونكە زانایان پێناسەی جوانكارییەكانیان كردووە بـە گرتنەبـەری نـەریتی جـوان و دووركەوتنـەوە لـەو ناشـیرینی و نەشـیاوییانەی عـەقڵی سـەلامەت لێیـان دووردەكەوێتـەوە، كـە دەكـرێ كۆبكرێنـەوە لـە ڕەوشـتی جواندا.

(الطاهر بن عاشور) پێناسەی ئەم پلەیە دەكات و دەڵـێ: "بەرژەوەندییـە جوانكارییەكان لای من، ئەوانەن كە باری میللـەت و كۆمـەڵگا لـە سیـستەمی ژیانیدا بەرەو تەواوی دەبەن، بـۆ ئـەوەی بـە دڵنیـایی و لـە ئاسایـشدا بـژی،

[89] علم المقاصد الشرعية، ، لا: ٧١.

هـەروەها وێنەیـەکی جـوان و دیمـەنێکی گەشـاوەی لەبەرچـاوی میللـەتان هەبێت، تا میللەتان حـەز بـە تێکـەڵیی موسـڵمانان بکـەن، یـان لێیـان نزیـك ببنەوە".[٩٠]

کـە وابێـت ئـەم پلەیـە (جوانکارییـەکان) پەیوەسـتە بـە تـەواوکاری و جوانکاریی کارەکان و گەیانـدنی بـە لووتکـەی ڕێکـی و جـوانی، لەبـەر ئـەوە شاتبی دەڵێ: "لەدەستدانی ئەم پلەیە (جوانکارییەکان) کەلێن ناخاتە کاری زەروری، یان پێویستی، بەڵکوو بـۆ تـەواوکاری و جوانکارییـە".[٩١] هونـەریش جوانکردنی دەربڕینە و ڕازاندنەوەی ئەو بەرهەمانەیە کە گوزارشت لـە دیـدی ئیسلام بۆ بوونەوەر دەکەن.

٢- ئـەو نموونانـەی زانایـان بـۆ پلـەی جوانکارییـان هێناوەتـەوە، ئـەوە دەسەلمێنن کە هونەر دەکەوێتە ئەم پلەیە. لـەو نموونانـەی زانایـان باسـیان کـردووە: جـوانی و پـاکی، هـەروەها بۆنخۆشـکردن، هونـەریش جـوانکردنی دەربڕینە، یان دەربڕینێکی جوانە لە هەست و نەستی مرۆڤەکان.

پۆلێنکردنی هونەر لە پلـەی جوانکارییـەکان، لـە گرنگیـی کەمناکاتـەوە، چـوونکە جوانکارییـەکانیش لـە مەبەسـتەکانی شـەرعن و چـەندان حـوکمی شەرعی بۆ پاراستنیان دانراوە.

ئـــەم ســـێ پلەیـــە (زەرورەتـــەکان و پێویـــستییەکان و جوانکارییـــەکان) هەرچەندە گرنگییان جیاوازە، بەڵام گشتیان مەبەسـتی شـەرعین و یـەکتری تەواو دەکەن.

[٩٠] مقاصد الشريعة الاسلامية، لا: ٨١

[٩١] الموافقات، بەرگی: ٢، لا: ٩

پێویـستییەکان، زەرورەتـەکان تـەواوتر دەکـەن، جوانکارییـەکانیش پێویستییەکان و زەرورەتەکان تەواوتر دەکەن.

بـۆ ڕوونکردنـەوەی زیـاتری پایـەی جوانکارییـەکان و پەیوەنـدیی بـە مەبەستەکانی دیکەوە، (شاطبي) دوو ڕێسای گرنگی باس کـردووە "یەکـەم: لەدەستدانی جوانکارییەکان بە ڕەهایی، یان پێویستییەکان بـە ڕەهـایی، بـە شێوەیەك لـە شـێوەکان ئەگـەری لەدەسـتدانی زەرورەتـەکانی لـێ دەکـرێ. دووەم: پێویستە پارێزگاری لە پێویـستییەکان و جوانکارییـەکان بکـرێ، بـۆ پاراستنی زەرورەتەکان".[٩٢]

لەسـەر بنـەمای ئـەو دوو ڕێـسایە، بۆمـان ڕووندەبێتـەوە ئەگـەر هەنـەری پەیامدار و ئاراستەکراو، بەپێی تێڕوانینی ئیـسلام بـۆ بوونـەوەر لـە مەیـدانی هونـەردا ون بێـت، ئـەوە ئێمـە ئـامرازێکی گرنگـی سـەردەمییانە لەدەسـت دەدەیـن، کـە لـە ئامرازەکـانی پاراسـتنی زەرورەتـەکان و پێویـستییەکانە، چـوونکە هونـەری خـراپ و ڕووخێنـەر (الفـن الفاسـد) ئـارەزوو و ڕەفتـارە نەشـیاوەکان بـۆ خـەڵکی دەڕازێنێتـەوە، پاڵـەوانێتیی گاڵتـە (مزیـف) بەرزدەکاتەوە، جەستەی لەناوچوو پیرۆز دەکات، پاسـاو بـۆ تاوانـەکانی نـاو کۆمـەڵگا دەهێنێتـەوە، ئـەوەش کـار لـە پاراسـتنی زەرورەتـەکان و پێویستییەکان دەکات.

ئیبن عاشـوور دەڵـێ: "داخـستنی ڕێگاکـانی فەسـادی و خراپـەکاری، لـە جوانکارییەکانە، کە باشتر و جوانترە لە چاوەڕێبوونی تێکەوتنی"[٩٣].

---

[٩٢] الموافقات، بەرگی: ٢، لا: ١٣

[٩٣] مقاصد الشريعة الاسلامية، لا: ٨١.

لەم سەردەمەدا دەبینین هونەر چۆن دەڕەخسێندرێ (گۆرانی بێت یان فیلم و دراماکان...هتد) بۆ بڵاوکردنەوەی کوشتن و تاڵان و دزی و هاندانی پەیوەندییە سێکسییە ناشەرعییەکان و پاساوهێنانەوە بۆ خیانەتی هاوسەرگیری. ناسینی ئەو مەبەستانە و پلەکانی، یارمەتیمان دەدا بۆ دانانی کارەکان لە شوێنی گونجاوی خۆیان، هەروەها لەپێشینەکانمان (الاولويات) لە مەبەستە شەرعییەکان پێ دەناسێنی، زەروورەتێك، یان پێویستییەك بۆ پاراستنی جوانکارییەك لەدەست نادەین، زێدەڕۆیی لە جوانکارییەکاندا ناکەین بە شێوەیەك لە مەبەستە شەرعییەکان دەرچێت، بۆیە ئەگەر هونەر بووە بەربەستێك لە پێش بەدەستهێنانی زەروورەتەکان، یان پێویستییەکان، یان بۆ مەبەستی دروست بەکار نەهێنرا، ئەوە لە سنووری جوانی دەردەچێت و پایەکەی لەدەست دەدات.

جەمیل عەبدولقادر دەڵێ[٩٤]: "وەك مرۆڤێك لەگەڵ سەرسامی و عیشقم بۆ بەرهەمەکانی موسڵمانان، لە بیناسازی و هونەر کە کۆمەڵگاکانی دیکە پێینەگەیشتوون (یان پێی ناگەن)، بۆ نموونە کۆشکی حەمرا لە غەرناتە، کە چەند ساتێك وەستام تێدا و دەمڕوانییە ئەو بەرهەمەی هونەرمەندی موسڵمان لە یەکێك لە ژوورەکانیدا پێی هەڵساوە، لە نوێکاری و داهێنان، کە لە گشت وەسفێك بەرزترە. بەڵام قەناعەتم وایە کە شەرع ئەوەی ڕەتکردووەتەوە، نابێتە سەربەرزیی موسڵمانان، بەڵکوو دەبێتە هۆکاری لەدەستدانی سەرچاوەکانیان، لەبەر ئەوە موسڵمانان بەدەرنران لە (اندلس)، چوونکە لەناو کۆشکەکانیان ڕادەکشان و دەیانزانی لە ڕێگەی گەیشتن بە

[٩٤]مامۆستای ئەندازیاریی تەلارسازی لە زانکۆی (ملك فیصل) لە سعودیە، خەڵاتی مەلیك فەهدی پێ دراوە بۆ توێژینەوەکانی لە بواری ئەندازیاریی تەلارسازی بۆ جیهانی ئیسلامی، ساڵی ١٩٨٦ز.

دەسەڵاتەوە ئەو خۆشگوزەرانییەیان دەست دەکەوێت، ڕکابەری و دژایـەتیی یەکتریان دەکـرد لەسـەر دەسـەڵات و ناکۆکییـان کەوتـە نێـوان و پەرتـەوازە بـوون، هـەر بۆیـەش لـە (انـدلس) بـە ڕیـسوایی بـەدەرنران". [95] جوانکـاری و خەریکبوونی و بێ ئاگایی لە زەرووڕەتەکان و پێویستییەکان، سەردەکێشی بۆ دەرچوون لە مەبەستەکانی شەرع، بۆ پلەی زێدەڕۆیی و ئیسراف (فضلة)، لە پلەی جوانکاریدا نامێنێتەوە، هەر ئەوەیشە کۆمـەڵگاکانی ئـەم سـەردەمە پێوەی دەناڵێنن.

دروسـتکردنی کۆشـك و گرنگیـدان بـە بیناسـازی و ڕازاندنـەوەی لـە چوارچێوەی شەرعدا، کارێکە ئیسلام ڕێی لێ ناگرێ، بەڵام هەموو گرنگیدانی پێشەواکان (القادة) بەو بوارە، بە شـێوەیەك ئەرکـەکانیان لـە بـیر بباتـەوە، پەیوەندیی بـە جوانییـەوە نامێنێـت، چـوونکە جـوانیی ئـەوان لەوەدایـە کـە شەونخوونی بکـەن بـۆ خۆشـیی میللـەتیان و هـەڵگرتنی سـتەم لەسـەریان و بەرپاکردنی دادپەروەری.

## ڕۆڵی هونەری ئیسلامی لە بەدیهێنانی مەبەستە گشتییەکانی شەرعدا

هونـەر بـە ئـامرازێکی کاریگـەر هـەژمار دەکرێـت، لـە ئامرازەکـانی ئاراستەکردنی کۆمەڵگا بە گشت توێژەکانیەوە، بە تایبەتی لـەم سـەردەمەدا کـە سـەردەمی جیهـانگیری و کرانـەوەی کولتوورەکـان و هونـەرە جیاکـانی میللەتانە، کاریگەریی هونەریش بە گشت وێنەکانیەوە لە بنیاتنـانی عـەقڵ و هەستی میللەتاندا، شاراوە نییە.

[95] عمارة الارض، لا: ٣٣٥.

موسـڵمانانیش لـەو ڕێسایە بـەدەر نـین، کاریگـەریی فـیلم و گۆرانییـە بیانییەکان –خۆماڵییەکانیش کە لە فەلەکی ئەواندا دەسوڕێنەوە– و چەندان جۆر هونەری سەردەم، تێبینی دەکرێن، کە چۆن هێرشـیان کردووەتـە سـەر بازاڕی موسڵمانان و کاریـان لـە ڕەفتـار و بۆچـوونەکانیان کـردووە، چـەندان ئاسەواری خراپیان لەسەر گەنجان بە تایبەتی و خەڵکی بـە گـشتی هـەبووە. جگە لە بەفیڕۆدانی کات و سامان، هەروەها بەشداریی کردووە لە داگیرکردنی عەقڵی میللەتان و بێ ئاگای کردوون لە بابەتە گەورە و چارەنووسسازەکانی کۆمەڵگەی موسڵمانان.

ئـەو هێـرش و تەوژمـەی بـەها مرۆییـەکان بـە گـشتی و ئیـسلامیش بـە تایبەتی، لە ڕێگای کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و هونەری سەردەمەوە ڕووبـەڕووی دەبێتــەوە، وا پێویــست دەکــات گــشت ئــامراز و ڕێگــا بەردەســتەکان و دروستەکان، بخەینە گـەڕ بـۆ پاراسـتنی ئـەو بـەها پیرۆزانـە. ئـەو هونـەرەی گونجـاوە لەگـەڵ ئیـسلام، ئـەو هونەرەیـە کـە مەبەسـتەکانی ئیـسلام لـەناو میللەت و مرۆڤایەتیدا بەدی دێنی.

مەبەسـتەکانی شـەرع، لـە ڕێگـەی ئامرازەکانیـەوە نـەبێ، بـە تـەواوی ناپـارێزرێ، ئـەو ئامرازانـەی مەبەسـتەکان بـەدی دێـنن و دەیـان پـارێزێ لـە لەناوچوون. هونـەری ئیـسلامی ئەگـەر ئـامرازیش بێـت، بـەڵام دەچـێتە ژێـر مەبەستە شـەرعییەکان، (ابـن القـیم) دەڵـێ: "چـوونکە مەبەسـتەکان بـەدی نایـەن، تـەنیا لـە ڕێگـای ئامرازەکـان و هۆکارەکانـەوە نـەبێ، ئـەو ئـامراز و هۆکارانــەش شــوێنکەوتووی مەبەســتەکان دەبــن. ئامرازەکــانی حــەرام و تاوانـەکان، خراپـی و ڕەتکردنـەوەیان بـەپێی بەشـداری و کاریگەرییانـە لـە مەبەسـتەکان و پەیوەنـدییان بـە حەرامەکـەوە... کـە وابـوو ئامرازەکـانی

خواپەرستی، لە ڕووی خۆشەویستی و ڕێگەپێدانیەوە، بەپێی کاریگەرییانەلە بـەدیهێنانی مەبەسـتەکان، ئـامرازی مەبەسـت شـوێنکەوتووی مەبەسـتە، هـەردووکیان مەبەسـتن، بـەڵام مەبەسـتەکان وەکـو مەبەسـت، مەبەسـتن، ئامرازەکانیش وەکو ئامراز مەبەستن". [96]

پێـشتریش ڕوونکرایـەوە کـە هونـەر لـە مەبەسـتە جوانکارییەکانـە، بۆیـە پێویستە موسڵمانان ئەو ڕێگایە و ئەو ئامرازە بۆ پاراستنی زەروورەتەکان لە ڕووی بوون و نەبوونەوە، بەکاربهێنن.

ئەو فیلم و درامایانەی چـەمکەکانی بیروبـاوەڕ و بـەها ئیـسلامییەکان لـە واقیعی ژیاندا جێگیرتر دەکەن، بەشداری لە پاراستنی ئایین و دەسـت گـرتن بە بەها بەرزەکانیەوە دەکەن. ئەگەر هونەر ئەو ئازار و خراپەکارییـە نیـشان بـدات و بخاتـەڕوو کـە لـە ئـەنجامی دوورکەوتنـەوە لـە ئیـسلام ڕووبـەڕووی مرۆڤایەتی بوونەتەوە، لە شـێوەی نوانـدن یـان تابلۆیـەکی شـێوەکاری یـان سـروودێکی کاریگـەردا بێـت، ئـەوە بەشـداری لـە پاراسـتنی ئـایین لـە ڕووی نەبوونەوە دەکات.

جوانکارییـــەکان، تەواوکـــەری زەروورەتـــەکان و پێویـــستییەکانن. لـــە تەواوکارییەکانی مەبەستە زەروورەتەکان، دەرخستنی دروشمـەکانی ئـایین و سوننەتەکان و ئادابەکانیەتی، بۆ تەواوکردنی پاراستنی ئـایین و دەرخـستنی لە واقیعی ژیاندا.

ئەو هونەرەی بـەهای مـرۆڤ گـەورە دەکـات و پاراسـتنی کەرامـەتی بـەرز ڕادەگـرێ و وێنـــەی قەباحـــەت و ناشـــیرینی کوشـــتنی مـــرۆڤ و دەرەنجامـــە خراپەکانی دەگرێ، دەچێتە ناخی پاراستنی نەفسەوە. ئەو هونەرەی بەهای

---

[96] اعلام الموقعين، بەرگی: ٣، لا: ١٠٢-١٠٣.

زانست و زانایان له ڕێگای بەرهەمی هونەری و دژایەتیی ئەفسانەکانەوە بەرز ڕادەگرێ، بەشداری لە پاراستنی عەقڵی کۆمەڵگا لە لادانە هرزییەکان دەکات. ئەو هونەرەیشی هەستەکانی خۆشەویستی و بەزەیی لە چوارچێوەی خێزاندا دەخاتە ڕوو و بەرز ڕایدەگری و دژایەتیی خراپەکاری و تاوانەکان دەکات، بەشداری لە پاراستنی وەچە و نەسەبدا دەکات.

ڕۆڵی هونەریش لە پاراستنی ماڵ و سامانی خەڵکدا شاراوە نییە، ئەگەر بەهای ماڵی خەڵك بەرز ڕابگرێت و دژایەتیی دزین و غەش و گەندەڵی کە لە کۆمەڵگەکانی ئەم سەردەمەدا تەشەنەی کردووە، بکات.

هەرچەندە هونەر لە پلەی جوانکارییەکاندا دێت، بەڵام بەڵگەکان گرنگیی ئەو بوارە دەسەلمێنن، کە بە کارێکی تەواوکار و بەهێزکەری بەرژەوەندییە زەروورەتەکان و پێویستییەکان هەژمار دەکرێت. مەشخەڵێکی شارستانیەتە، کە شارستانیەتی ئیسلامی پێ جوانتر دەکرێت.

هونەرە سەردەمییەکان لای ڕۆژئاواییەکان سەری هەڵدا و ئامرازەکانی پەرەی سەند. لە قۆناغێکی مێژووییدا موسڵمانان لە بواری زانستی و تەکنۆلۆژیدا، بەهۆی ڕووخانی خیلافەتی ئیسلامی و کەوتنی و لاتە ئیسلامییەکان بە دەستی داگیرکەران، لە پاشەکشێدا بوون، ئەوەیش بووە هۆکاری دواکەوتنیان لە بەرهەمهێنانی هونەر، وەکو تێکڕای بوارەکانی زانست و تەکنۆلۆژیا، ئەوەش ڕۆڵی هەبوو لە دەستبەسەرداگرتنی هونەری نائیسلامی و ڕۆژئاوایی لەسەر هونەر و بەرهەمهێنانی هونەری سەردەم. ئەوەی کاریگەریی هونەریشی زیاتر کرد، ئەو شۆڕشە بوو کە بوارەکانی ڕاگەیاندن و گەیاندنی ئاسان و پەیوەندیکردنی گرتەوە، کە وای کرد بەرهەمە هونەرییەکان بگەنە گشت کون و قوژبنێکی سەر ڕووی زەوی و بگەنە ناو ماڵ

و خێـزان، ئـەوەش مەترسـیی لەسـەر ناسـنامەی موسـڵمانان دروسـت کـرد. پەخشی ڕاستەوخۆ، ڕۆڵێکی مەترسیدار لە لێڵکردنی ناسـنامەی موسـڵماناندا دەگێڕی، کە هەر تاکێك دەتـوانی بـە داگـرتنی دوگمەیـەك لـە دەسـتیدا، لـە ماوەیـەکی کەمـدا هـەزاران کـەناڵ و سـایتی ئینتـەرنێت بەسـەربکاتەوە، کـە زۆربەیان هونەر و بەرنامەی فاسد و ڕووخێنەر بڵاودەکەنەوە.

ئەگـەر موسـڵمانان لـە سـەردەمی داگیرکـەران و دواکەوتنـدا بەهانـەیان هەبووبێ، ئـەوا لـەم سـەردەمەدا بەهانەیـەکیان نییـە، بـە تایبـەتی لـە دوای سـەرهەڵدانی ڕابـوونی ئیـسلامی، کـە زۆربـەی کۆمەڵگـە موسـڵمانەکانی گرتووەتـەوە، بەشـێك لـە وڵاتـە ئیـسلامییەکانیش هـەنگاوی گـەورەیان لـە کاروانی بنیاتنانی پێشکەوتنی زانستی و تەکنیکی ناوە. لـە پێویـستییەکانی ئەم قۆناغە، هەڵسانی دامەزراوە زانستی و ئیداری و خاوەن بڕیارەکانـە لـە و وڵاتـە ئیـسلامییەکان، بـە گەڵاڵـەکردنی هونـەری ئیـسلامی و دەرخـستنی بـۆ جیهانی ئیسلامی و مرۆڤایەتی، ئـەوەش بـۆ تـەواوکردنی پـرۆژەی ڕاپـەڕینی ئیـسلامی، بـۆ بـەدیهێنانی مەبەسـتە شـەرعییەکان و پاراسـتنیان، چـوونکە زیندووکردنەوەی هونەری بەرز و پاك بـۆ خزمـەتکردنی ئیـسلام و پـشتیوانی کردنـی موسـڵمانان و هەوڵـدان بـۆ جـوان وێنـاکردنی و بڵاوکردنـەوەی بـە تەکنیکە نوێ و بەهێزەکان و خستنەڕووی لە بۆنـە و کـۆڕە جەماوەرییـەکان بە گشت ئامرازەکانی پەیوەندیی سەردەم، یەکێکە لە جۆرەکانی جیهادکردن لە بواری بانگخوازیدا.

# باسی شەشەم
# مەبەستەکانی هونەری ئیسلامی

## یەکەم: مەبەستی گشتیی هونەری ئیسلامی

ئەگەر هونەری ئیسلامی بریتی بێت لە دەربڕینی جوان لە دیدی ئیسلامی بۆ بوونەوەر، ئەوە مەبەستی گشتیی هونەری ئیسلامی بریتییە لە (نیشاندانی دیدی ئیسلامیی هەمەلایەنانە بۆ جوانی و بەهاکانی). هونەری ئیسلامی ئەو مەبەستە گشتییەی لە هەموو جۆرەکانی هونەردا بەرجەستە دەکات، هونەری دەستی بێت، یان بینراو، یان بیستراو.

دەکرێ ئەو مەبەستە لە دەربڕینی هونەری لە قورئانی پیرۆزدا و لە سوننەتی پێغەمبەردا هەڵبهێنجین، هەروەها لە بەرهەمی هونەری موسڵمانان کە گوزارشت لە تێڕوانینی ئیسلامی بۆ جوانی دەکات. بۆیە (هونەری ئیسلامی زۆر پێویستی بەوە هەیە کە بگەڕێتەوە بۆ قورئان، چوونکە قورئان ئەو زەخیرەیە کە ئیلهامی ژیان دەکات).

کاتێك هونەری ئیسلامی بۆ ئـەو مەبەسـتە هـەوڵ دەدات، تـەنیا بـاس لـە ڕاستییەکانی ئیـسلام بـە بیروبـاوەڕ و کەسـایەتی و ڕووداوەکانیـەوە ناکـات، بەڵکوو باس لە بوونەوەر بە گشتی و هەموو ڕووداوەکـانی دەکـات، بـەڵام لـە سۆنگەی ئیسلام و بە هەستێکی ئیسلامییانەوە.

قورئانی پیرۆز دیمەنە سروشتییەکانی بۆ گوزارشت کردن لە واتا دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان بەکارهێناوە، هەر وەکو لـە فـەرموودەی خـوای گـەورەدا هاتووە (وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً حَتَّى إِذَا جَاءَهُ لَـمْ يَجِـدْهُ شَـيْئًا و وَجَـدَ اللَّـهَ عِنْـدَهُ فَوَفَّـاهُ حِـسَابَهُ و اللَّـهُ سَـرِيعُ الْحِـسَابِ ، أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا و مَنْ لَمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِنْ نُورٍ) [النور: ٣٩–٤٠] واتە: ئەوانەی کە بێبڕوان، کردەوەکانیان وەك سەرابێك وایە –سەراب تیشکێکە کاتی زۆر گەرم لە بیابانـدا دەردەکـەوێت و وەك ئاو دێتە پێش چاو– لە بیابانێکدا بریسکە بداتەوە، کەسێکی زۆر تێنوو لە دوورەوە بە ئاوی دەزانی، بە پەلە دەڕوات بۆی، کاتێك دەگاتە لای، هـیچ بەدی ناکات. لە قیامەتدا کافر، خوا دەبینی، ئامادەیە لە لایدا، ئینجا خوا بە چاکی پاداشتی کردەوەکانی دەداتیٚ، وە خوا خێرایە لە لێپرسـینەوەدا، یـان کردەوەی بێبڕوایان وەك چەند تاریکییەك وایە لـەناو دەریایـەکی قووڵـدا کـە شەپۆل لەسەر شەپۆل دایپۆشابیٚ، لەسـەر ئـەو (شـەپۆلە)یـشەوە هـەورێکی ڕەشی (باراناوی) بێت، تاریکییەکان نیشتبنە سەر یـەکتری، ئەگـەر دەسـتی دەربێنی، نزیکە دەستی خۆی نەبینێت (لەبەر تاریکی) جـا هـەر کـەس خـوا نووری ئیمانی پیٚ نەبەخشیبیٚ، ئەوەی ڕووناکی بێت، نییەتی.

کاتێك ئەو ئایەتانـە دەخوێنیتـەوە و لێـی وردەبیتـەوە، کـە دڵـڕفێنترین تابلۆیە لە تابلۆکانی تاریکی لە دیمەنەکانی سروشت، کە فڵچەی تابلۆکێشێك یان کامێرای وێنـەگرێك بتـوانی وێنـەی بکـات. هەرچـەندە دیمەنەکـە لێـرەدا لەبەر خودی خـۆی نیـشان نـەدراوە، بـەڵکوو بـۆ وێنـاکردنی بـاری تـاریکیی دەروونی کە کوفر و بێبـاوەڕی لـە دەروونـی مرۆڤـدا پەیـدای دەکـات، بـەڵام دیمەنەکە تابلۆیەکی سروشتیی جوان نیـشان دەدات، کـە پـڕە لـە هەسـت و خەیاڵ و هونەر بە ئازادی و ڕەهایی کاری تێدا دەکات.[٩٧]

هونەری ئەم سـەردەمە، زیـاتر لـە سـەردەمەکانی پێـشوو، پێویـستی بـە نیشاندان و خستنەڕووی تێڕوانینی ئیسلامە بۆ بەها جوانییەکان، ئەوەش بە هۆی ئەو خواری و نادروستییەی لـە وێنـاکردنی ڕاسـتیی مـرۆڤ و پێگـەی لـە بوونەوەردا بەدی دەکرێ. هونەری ئیسلامی بایـەخێکی تایبـەت بـە ڕاسـتیی گشتگیری و تەواوکاری لە دەروونی مرۆڤدا دەدات، بۆ نموونە: ناچـێت تـەنیا لایەنی ماددیی مرۆڤ بەدەر لە لایەنی ڕۆحیی نیشان بدات.

ئەوەی لە قورئان وەری دەگرین، هێڵە گشتییەکان و میتۆدی گشتییە بۆ بەرهەمی هونەری.

محەممەد قوتب دەڵی: "کاتێك هەوڵ دەدەین سوود لە قورئان بـۆ بـواری هونەر وەربگرین، پەنا دەبەینە بەر هەردوولا بە یەکەوە: لایەنی چەمکەکان و لایەنی ڕێگاکانی ئەنجامدان، نەك بۆ لاساییکردنەوەی، بەڵکوو بـۆ وەرگـرتنی ئەو ئاراستەی کە هـەڵیگرتووە و بـۆ هۆنینـەوەی ئـەو هونەرانـەی بەرهـەمی دێنین لەسەر شێوازەکەی".[٩٨]

---

[٩٧] بروانە: منهج الفن الاسلامي، لا: ١٥٣.

[٩٨] سەرچاوەی پێشوو، لا: ١٤٠

ئەو دید و تێڕوانینە بۆ بەرهەمە هونەرییەکانی موسڵمانان ، بە تایبەتی لە هونەری بیناسازی و زەخرەفە و خۆشنووسیدا ڕەنگیداوەتەوە، کە ئەو هونەرانە سەردەمی پێشوو بوونیان هەبوو.

بەڕاستی هونەرمەندی موسڵمان لە ڕێگای ئەو فۆرمە موجەڕڕەد و (الاشكال المجردة) ڕووەکی و ئەندازیارییەی کە هونەری ئیسلامی لە هونەرەکانی دیکە جودا دەکاتەوە، گوزارشتی لە واتا بیروباوەڕییەکانی دەکرد، هەر وەکو لە کارە هونەرییەکانی کە سیمای یەکایەتی و تەجریدیی پێوە دیار بوو، گوزارشتی لە باوەڕی یەکتاپەرستی کردووە.

یەکەم ڕەگەز لە ڕەگەزەکانی کاری هونەری، بریتییە لە خاڵ (نقطة) کە درێژدەبێتەوە و دەبێتە هێڵ(خط). هێڵیش خولدەداتەوە بۆ ئەوەی بازنەیەك دروست بکات و سنووردار دەبێت بۆ چوارگۆشەیەك. ئەو فۆرمانە، فۆرمی سەرەتایی و ئەلفوبێی ناوەندی و یەکەمینن، کە هونەری ئیسلامیی لێ بەرجەستە بوو. لە ئیسلامدا (خاڵ) سەرەتایە، کە ئەو فۆرمە بێ کۆتاییانەی لێ دەردەچن، ئەوە وەکو گوزارشتێکی هزری و بیرمەندی جوانییە، گوزارشت لە گەورەترین ڕاستی لە بوونەوەردا دەکات، کە ڕاستیی دروستکردنە (حقيقة الخلق)، دەرچوونی گشت ئەو جۆرە ناکۆتاییانە لە سەنتەردا (سەرچاوەی بوونەوەر).

لێرەدا هزر و باوەڕ و ویژدان، لە دەروونی هونەرمەندی موسڵماندا بۆ گوزارشت کردن لە پاکیی خۆبەدوورگرتن لە پێچواندن (تشبيه)، ئاوێتەی یەکتر دەبن.[٩٩]

---

[٩٩]الاصول الجمالية و الفلسفية للفن الاسلامي، لا: ١٥٧.

هونەرمەندی موسڵمان خۆی لە وێنەکردنی ڕەهەندی سێیەم بەدوور گرتووە، چوونکە لاساییکردنەوەی دروستکراوی خوایە، مرۆڤیش بێ توانایە لە لاساییکردنەوەی خەلقی خوا و پێچواندنی، ئیسلامیش بێتوانایی مرۆڤی لەو بوارەدا تۆمار کردووە، چوونکە گرنگ گواستنەوەی جیهانی دەرەوە نییە، بەڵکوو تێکەڵبوونی تەواو لەگەڵ ڕاستییەکاندا گرنگە.

هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسان ڕەخنەیان لە هونەری ئیسلامی گرتووە، بەوەی کە هونەرێکی زەخرەفەییە، بەبێ ئەوەی لێی وردببنەوە و قووڵببنەوە لەو واتایانەی گوزارشتی لێ دەکات. لەگەڵ ئەوەش هەندێکی دیکە دانیان بە تایبەتمەندیی هونەری ئیسلامی و کاریگەریی لەسەر هونەری نوێدا ناوە، لەگەڵ جیاوازیی زۆری دەسەڵاتی شارستانیەتی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، ئەوانە دانیان بەوەدا ناوە پیکاسۆ کە خودی خۆی هونەرمەندێکە، گشت ڕێنماییەکانی هونەری ئیسلامیی پەیڕەو کردووە. هەندێکی دیکە گەیشتوونەتە ئەوەی کە هونەری (رقش) –کە جۆرێکە لە هونەری زەخرەفە– بناغەی هونەری تەجریدیی سەردەم بووە.[100]

شارەزایانی بواری هونەر و ڕەخنەی هونەری، باس لەوە دەکەن کە هونەری ڕۆژئاوایی لە قەیراندایە، وا پێدەچێت ئەو قەیرانە لەم دوو هۆکارەوە سەرچاوەی گرتبێت:

١– لادانی هونەر لە چەمکی (تەقلیدی) کە لەسەر واقیعیەت دامەزراوە و دانانی مرۆڤ بە تەوەری جوانیی هونەری..

٢– بوونی ئاستەنگ لە گەڕان بە دوای چەمکێکی نوێ بۆ هونەر، کە گونجاوبێت لەگەڵ بونیادە نەتەوەیی و پێشکەوتووەکانی سەردەم، ئەوەش

[100] الفن الاسلامي، عفيف البهنسي، لا: ١٩.

بووه هۆی ئەوەی هونەرمەندان ڕوو لـە جیهـانی هونـەرەکانی دیکـە بکـەن و سوود لە دیاردە و نەریتەکانیان وەربگـرن، هـەر وەکـو (گۆگـان) لـە تـاهیتی ژیـاوە و لــە نــەریتی ژیانیــان و هونــەری دوورگــەکانی ئەتڵەســی ســوودی وەرگرتووە، هەروەها (فـان کـوخ) کاریگـەریی هونـەری یابـانی لەسـەر بـوو، پیکاسۆش هونەری ئەفریقی کاری تێکرد و سوودی لێ وەرگرت.[١٠١]

بەرجەستەکردنی دیدی ئیسلامی بۆ جوانی لە هونـەردا و پێشکەشکردنی بە جیهانی هونەری سەردەم، بەرزترین نموونەی جوانی و هونەر بەدی دێنێ، لە هەمان کاتیشدا پەردە لەسەر جوانییـە ڕووکەشـییەکەی زۆربـەی هونـەری ئــەم ســەردەمە لا دەبـات، کـە زۆرێـك لــە چـالاکوانی ئــەو بـوارە پێــی هەڵخەڵەتاون.

هەروەها بەرجەستەکردنی ئەم مەبەستە شەرعییە لە هونەردا، کاریگەریی لەسەر چـینێکی فراوانـی بـواری هونـەر دەبـێ و ڕاسـتیی ئـەو ئایینـەیان بـۆ ڕووندەبێتــەوە. بــە ئــازادکردنی لــە پەرســتنی جــوانیی ڕووکــەش و ڕازاوە، کەرامەتی مرۆڤ دەگێڕێتەوە، بـۆ پەرسـتنی بەدیهێنـەری جـوانی، کـە گـشت سیفەتی جوانی و تەواویی هەیە.

---

[١٠١] الفن الاسلامي، لا: ٢٢.

## دووەم: مەبەستە تایبەتەکانی هونەری ئیسلامی

لەژێر ڕۆشنایی دەقەکانی شەرع و مەبەستەکان، دەکرێ مەبەستە تایبەتەکانی هونەری ئیسلامی لەم خاڵانەی خوارەوە پوخت بکەینەوە:

**١- بانگخوازی بۆ لای خوا:**

ڕۆڵی هونەر و کاریگەریی لە بانگخوازی و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕ و بەها بەرزەکانی ئیسلام، شاراوە نییە. خەڵکی ناموسڵمان ئەو ئامرازەیان قۆستووەتەوە بۆ بانگەوازیکردن بۆ بیروباوەڕە پووچەڵ و مەبەستە ناشەرعییەکان، بەڵکوو زۆر جاریش بۆ ڕەتکردنەوەی ئایینەکان و بەها بەرزەکانیان و بڵاوکردنەوەی تاوان و خراپەکاری. پێویستە لەسەر موسڵمانان ئەو ئامرازە بۆ بانگەوازی ئیسلامی و بڵاوکردنەوەی پەیامی خوای گەورە و سوودلێوەرگرتنی بەکاربهێنن.

ئەگەر پەیامی ئیسلام لە ناوەرۆك و مەبەستدا جوان بێت، ئەوە بانگەواز بۆ کردنی بە جوانیی هونەرەکان و قەشەنگی، جۆرێکە لەو حیکمەتەی کە خوا فەرمانی پێ کردووین لە بانگەوازیدا پەیڕەوی بکەین: (ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ و الْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ و جَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ و هُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ) [النحل: ١٢٥] واتە: خەڵکی بانگ بکە بۆ ڕێگەی پەروەردیگارت بە لێزانی و دانایی و ئامۆژگاریی چاك و شیرین، لەگەڵیان بدوێ بە چاکترین شێوە، بێگومان پەروەردگارت خۆی چاك دەزانێ بەوانەی گومڕا بوون و لایانداوە لە ڕێگاکەی، هەر خۆیشی زانایە بەوانەی لەسەر ڕێگای ڕاستن.

(الطاهر بن عاشور) له واتای حیکمەتدا دەڵێ: "ناوێکە گشت ئەو وتە و زانستانە دەگرێتەوە کە ڕەچاوی چاکسازیی بار و بیروباوەڕی خەڵکی و چاکسازییەکی بەردەوام و نەگۆڕ دەکەن".[102]

خەڵکی بە زۆرێك لە بیروباوەڕی پووچەڵ و ناحەق فریوو دەدرێن، لە ڕێگای ڕازاندنەوە و نیشاندانی بە ئامرازی جوان و قەشەنگ. کە وابێت پێویستە جەخت لەسەر ئەو ڕاستییە بکرێتەوە کە کەمەندکێشی و جوانی لە کاری بانگخوازیدا پێویستە لەسەر دوو لایەن دابمەزرێ و ڕەچاو بکرێ، ئەو دوو لایەنەش بریتین لە فۆرم و ناوەرۆك (الشكل والمضمون).

جوانیی هونەر عەقڵەکان سەرسام دەکات و سەرنجەکان ڕادەکێشێت. چیرۆکی مامەڵەی پێغەمبەر سولەیمان (ﷺ) لەگەڵ بەلقیس، بەرزترین نیشانە و بەڵگەیە لەسەر ڕۆڵی هونەر و کاریگەریی لەسەر دڵ و هۆشی مرۆڤەکان. (د. و هبة الزحیلي) دەڵێ: "پێغەمبەر سولەیمان (ﷺ) لەگەڵ دەرخستنی موعجیزەی پێغەمبەرایەتی بە ئامادەکردنی عەرشی بەلقیس، ویستی بە هێزی موڵك و بەرزیی دەسەڵاتی سەرسامی بکات، کە بەرزتر و بەهێزترە لە دەسەڵاتی شانشینی بەلقیس و و لاتە دەوڵەمەندەکەی و کۆشکە بەرزەکانی، هەر وەکو بەلقیس لە کۆشکی سولەیمان هونەرێکی دڵڕفێنی بینی لە بیناسازی، کە هاوشێوەی نەبوو، تەنانەت لەم سەردەمەی ئێمەشدا کە سەردەمی پێشکەوتنی زانست و هونەرە، هاوشێوەی نییە...".[103]

---

[102] التحرير و التنويربەرگی: ١٣، لا: ٢٦٣

[103] التفسير المنير في العقيدة و الشريعة و المنهج، بەرگی: ١٠، لا: ٣٣٧

بانگخوازان پێویستییەکی زۆریان بە هونەر بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان هەیە. بەکارهێنانی وێنە لە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بۆ مەبەستی بانگخوازی و فێرکردنی بەسوود، ناچێتە بازنەی حەرامەوە، بەڵکوو مەبەستێکی شەرعییە و پێویستە. ئەو پێویستییە ئەگەر تەنیا ڕێگا بوو بۆ گەیاندنی بانگەواز و زانستی بەسوود بۆ خەڵکی، پێویستتر دەبێت.

هەروەها دەکرێ هونەرە دەنگییەکان بۆ گەیاندنی وشەی حەق و بڵاوکردنەوەی بەها دروستەکان بەکاربێن. "ئەو هونەرمەندەی هونەرێکی دەنگی یان ئاوازێك دادەهێنی و دەیگەیەنێتە بە خەڵك و خۆیشی پابەند بێت بە بەهاکانی ئیسلام و ئادابەکانیەوە، ئەو هونەرمەندە هونەرێکی ئیسلامیی داهێناوە کە لەگەڵ مەبەستەکانی شەرع یەك دەگرێتەوە، بەڵکوو پاداشتیشی لەسەر کارەکەی دەبێت، ئەگەر خەڵکی بانگ بکات بۆ چاکە و نەهیش لە خراپە بکات ".[١٠٤]

**دووەم: پەروەردە و فێرکردن:**

هونەر بە ئامرازێکی کاریگەر لە بواری پەروەردە و فێرکردندا هەژمار دەکرێت، لەبەر هەبوونی ڕەگەزی جوانیی تێیدا، چوونکە جوانی دەسەڵاتێکی فراوانی لەسەر دەروونی مرۆڤەکان و کاریگەریی گەورەی لەسەر ئاراستەکردن و دەستگرتنی هەیە. ئەو کاریگەرییە لەم سەردەمەدا زیاتر بەدی دەکرێ لەوەی لە سەردەمەکانی پێشووتر. فیلم و گۆرانی و بەرنامە هونەرییەکان، بە هۆی ئامرازەکانی گەیاندن و پەیوەندییەوە، بە خێراییەکی زۆر دەگەنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، کە ملیۆنان خەڵکی لەسەر پەروەردە دەبێت، بە تایبەتی لە چینی گەنجان.

---

[١٠٤] التربية الجمالية الاسلامية، لا: ٢٤٤.

پـەروەردە و فێرکـردن مەبەسـتێکی سـەرەکیی هونـەرە. قورئـانی پـیرۆز شێوازی هونەریی جوانی بۆ پەروەردەکردنی خەڵك لەسەر مەنهەجی ئیـسلام و ئاراستەکردنیان بەپێی تێڕوانینی ئیسلام بۆ بوونەوەر بەکارهێناوە.

موسـڵمانان شـیعری فێرکردنیـان (الـشعر التعليمـي) بـۆ لەبـەرکردنی زانستەکان بەکارهێناوە، لەو سەردەمانەی شیعر ئەو شـێوازە هونەرییـە بـوو کـە بـاوبوو، لـەم سەردەمەشـدا هونـەر ڕۆڵێکـی گـرنگ بـە تایبـەتی لـە پەروەردەکردنی منداڵان و هەرزەکاراندا دەگێڕێ. ئەوەی زیـاتر پـشتگیریش لەو مەبەستە دەکات، دروست یاریکردنی منداڵانە بە بووکەشووشـە و یارییـە پەیکەرییەکان کە (القرطبي) لەوبارەیەوە دەلـێ: "بـە مەبەسـتی پێویـستیی منـداڵان و کـچان، بـۆ ڕاهێنانیـان لەسـەر پـەروەردەکردنی منداڵـەکانیان لـە ئاییندەدا".[105] کە وابێـت ئیـسلام هـانی بـەکارهێنانی ئـامرازە کاریگـەرەکان دەدات، ئەگـەر دژ نـەبن لەگـەڵ دەقـەکانی شـەرع و مەبەسـتەکانی لـە ڕێنماییکردنی خەڵك بۆ پەروەردەی دروست و فێرکردنی بەسوود.

فەیلەسوفەکان لە کۆنـەوە دەرکیـان بـە کاریگـەریی هونـەر کـردووە، بـە تایبـەت کاریگـەریی لەسـەر چـینی گـەنجان و پێگەیـشتووان. ئـەفلاتوون وا دەبینی ئەو هونـەرەی مەبەسـتی خزمـەتکردنی گەنجانـە و پـەروەردەکردنی ئەخلاقە، ئەو هونەرەیە کە خزمەت بە کۆمەڵگا و تاك دەکـات. ئـەو هونـەرە زیاتر دەمێنێتەوە و شیاوترە، کە عـەقڵی گـەنجان ڕاسـتدەکاتەوە (يقـوّم) و پــەرە بــە بــەهرەکانیان و بــە سـیما ڕەفتارییـەکانیان دەدات و دووریـان دەخاتەوە لە کاردانەوە و شەهوەت و مەیلی شەڕ لە دەروونیاندا دەکوژێت و دەروونیان ئارامدەکاتەوە.

---

[105] الجامع لاحكام القرآن بەرگی: ١٤، لا: ٥٦٠.

## ٣- پاراستنی کۆمەڵگەی موسڵمان:

لە ئەرکەکانی موسڵمانان، پاراستنی کۆمەڵگەکەیانە لەو مەترسییانەی هەڕەشەی لێ دەکەن، چوونکە پاراستنی کۆمەڵگە، پاراستنی ئایین و مەبەستەکانیەتی، مەترسییەکانیش لە سەردەمی جیهانگیریدا جۆراوجۆرن، لە ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و ئایینی.

لێرەدا دەرك بە بەهای قەڵغانکردنی ئایین و ئەخلاق بۆ پاراستنی گشت تاکەکانی کۆمەڵگا دەکەین، کاتێك هونەری پابەندبوو بە ڕۆڵی پاراستن هەڵدەستێت، تێبینی دەکرێت کە کۆمەڵگا پلە بە پلە بەسەر پەیژەی دڵنیایی و باشتربووندا سەردەکەوێ.[١٠٦]

بڵاوبوونەوەی فراوانیی ڕۆشنبیریی ڕۆژئاوایی نامۆ لە ئیسلامدا، زۆربەی بابەتەکانی و کاریگەری لە کۆمەڵگە موسڵمانەکان، دەرەنجامی کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگەی موسڵمانانە لەلایەن کۆمپانیا ڕاگەیاندنەکان و زاڵبوونیان لە دروستکردنی فیلم و موزیك لەژێر سێبەری بڵاوبوونەوەی کەناڵە ئاسمانییەکان و پەرەپێدانی پیشەسازییەکی ڕۆشنبیریی ئاراستەکراو بۆ چینی گەنجان، کە چینی فراوانن لەسەر ئاستی جیهان، ئەوان پیاوی داهاتوون کە لە کۆمەڵگەکانیاندا کاریگەری و دەسەڵاتیان دەبێت.

٤- بنیاتنانی شارستانیەت:

لە ڕێگای بەرهەمی هونەرییەوە دەتوانین سروشتی ئەو شارستانیەتە بزانین و بناسین کە بەرهەمە هونەرییەکەی بۆ دەگەڕێتەوە، هەروەها دەرك بەو بیروباوەڕ و بەهایانە دەکەین کە ئەو شارستانیەتەی لەسەری دامەزراوە. هونەر ڕۆڵێکی گرنگ دەبینی لە دایەلۆگی شارستانی، دکتۆر عەلی عومەری

---

[١٠٦] الفن الواقع و المأمول، لا: ٢٠.

دەڵێ: "لەژێر سێبەری زمانی جیهانگیریدا، ئەمڕۆ پێویستمان بە پەیوەندیی شارستانی هەیە، لە ڕێگای مۆزەخانەکانی هونەری ئیسلامییەوە، کە ئەوەی ئەمڕۆ هەمانە بەشێکە لەوەی بانگەوازی بۆ دەکەین، ئەوەش دەبێتە یەکێك لە ڕێگاکانی کاریگەری لە جیهانی ڕۆژئاوا، بە تایبەتی ئەگەر ئەو جۆرە مۆزەخانانە لە جیهانی ڕۆژئاوادا بکەینەوە. ئاوەڕدانەوە بۆ مۆزەخانە و پیشانگای هونەری ئیسلامی، مەنهەجێکی سەردەمییانەیە لە پەیوەندی کردن، کاریگەریی لەسەر دیدی ڕۆژئاوا دەربارەی ئیسلام دەبێت".[107]

مێژووی ئیسلامی دەوڵەمەندە و پڕە لە نموونەی هونەری، کە گوزارشت لە شارستانیەتی ئیسلامی دەکات و وێنە نایابەکەی لەنێو شارستانیەتەکان دەردەخات. ئەو هونەرەی هەڵقوڵاوی دیدی ئیسلامە بۆ بوونەوەر، بەشداری لە بنیاتنانی شارستانیەتی ئیسلامی و کەسایەتییە تایبەتییەکەی بەرجەستە دەکات. لە لای کەسی فەرەنسی و ئینگلیزی و ئیتاڵی، گرنگ نییە چیرۆکێك بخوێننەوە، یان شانۆگەرییەك ببینن، یان قەسیدەیەك، یان تابلۆیەك، یان بیناسازییەك، یاخود لاسایی هونەری ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتاڵی بکەینەوە، بەڵکوو ئەوەی لەلا گرنگە کە تایبەتمەندییەکانی هونەری یسلامی شارەزا بێت، کە شتێکی نایاب و ناوازە دەخاتە سەر ئەدەب و هونەری جیهانی.

**٥– وەڵامدانەوەی فریشکی (فطرة) مرۆڤ:**

فریشك و سروشتی مرۆڤ، تامەزرۆی جوانییە و چێژی لێ وەردەگرێ و هەوڵی بۆ دەدات، کە وابوو گوزارشتی جوان وەڵامدانەوە و ڕەنگدانەوەی ئەو فریشکەیە کە خوا مرۆڤی لەسەر خەلقکردووە.

[107] الفن المعاصر، لا: ١١٨.

کاتێــك ئیــسلام هەنــدێك جــۆری هونــەری حــەرام کــردووە، لەبــەر دەرچوونیەتی لە فریشکی ڕاستی مرۆڤ، چـوونکە هەسـتکردن بـە جـوانی لـە سروشتی مرۆڤدا، هەستێکی بنەڕەتیی فریشکییە، بە بـەردەوامی مـرۆڤ پێـی سەرسـامە و مـەیل بـۆ کردنـی لـە نەفـسی مرۆڤـدا سروشـتییە، لـە سـات و شوێنەکاندا دڵی بۆی دەچێت، ئەگەر لێی ونبێ تامەزرۆی بەدەستهێنانیەتی.

چێژ وەرگرتن لە بەرهەمی هونەریی دروست لە چوارچێوەی شـەرعدا، بـە بیــنین، یــان گــوێلێگرتن، یــان تێگەیــشتن بێــت، مەبەســتێکی هونــەریی ئیسلامییە، چوونکە "جوانی لەبەر خـودی خـۆی خۆشەویـستە و خـوازراوە، نەك لەبەر شتی دیکە. سوودی مرۆڤ لـە جوانیـدا بریتییـە لـە چـێژ و خۆشـی وەرگـرتن لـە بیـنین و بیـستن و بـۆنکردن و تێگەیـشتنی، چ شـتێك سـوودی زیاترە لـە دابینکـردن و بەدەنگـەوەهاتنی پێویـستییەك لـە پێویـستییەکانی فریشکی نەفسی مـرۆڤ، بینـینی جـوانی و بەدەنگـەوەهاتنی، پێویـستییەکی دەروونییە، کە وابوو سوودی مرۆڤ لە جوانیدا لە خودی جوانییەوە بەدەست دەکەوێت".[١٠٨]

قورئانی پیرۆز جێگیرکردنی ئەو مەبەستەی تێدایە، کە خـوا دەفـەرموێ: (قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ و الطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ) [الاعراف: ٣٢].

٦- گەشــەپێدانی بــەهای جــوانی و پــەروەردەکردنی موســڵمان لەســەر هەستپێکردنی.

---

[١٠٨] الجمال في منهج الاسلام و تشريعه لا: ٢٢.

ئـەو جوانییـەی لـە بوونـەوەردا بڵاوبووەتـەوە، لـە پـەرتووکی بینـراو و پـەرتووکی خوێنـدراوی خـوا، ڕێنماییمـان دەکـات بـۆ مەبەسـتی شـەرع لـە گەشەپێدانی جوانی و پەروەردکردنی موسڵمان لەسەر هەستپێکردنی، جوانی سیمایەکی دیارە لە سیماکانی ئەو بوونەوەرە، ئەگەر دیارترینیان نەبێت.

جـوانی لـە بوونـەوەردا ناچـاری نییـە، بـەڵکوو ڕەگـەزێکی مەبەسـتە و سیـستەمێکە، ئـەو سیـستەمەش هـەر وەکـو لـە ڕووی بوونـەوەر دیـارە، لـە چەندان دیاردەدا خۆی دەردەخا –چەندان دیـاردەی هەیـە– لەوانـە: وردی، هەماهـەنگی، هاوسـەنگی، پەیوەندیـدار بـە یـەکترەوە (الترابـط)، سـووکی جووڵەکردن هەرچەندە کێشی قورس بێت.

کە وابوو ئەگەر جوانی ڕەگەزێکی سەرەکی بێت لـە هونـەر، ئـەوە هونـەر بەشداری دەکات لە گەشەپێدانی هەسـتکردن بـە جـوانی و پـەروەردەکردنی موسڵمان لەسەر هەستپێکردنی و هەوڵدان بۆی، دەکرێت کۆمەڵێك حیکمـەت و بەرژەوەندی بەدەست بێنین لە مەبەستی شەرعدا لە پەروەردەکردنی مرۆڤ لەسەر جوانی، لەوانە:

أ– فریوونەدان بە جوانیی ڕووکەش (مزیف) و ڕازاندنەوەی شـەیتان، کـە جوانییـەکی ڕاسـتی و هەمەلایەنانـە نییـە، چـوونکە لایەنـەکانی جـوانی لـە ئیسلامدا، خۆی لە لایەنی هزری و باوەڕی و هونەریدا دەبینیتەوە.

(لێرەدا هونەرە لەشییەکان زێدەڕەوین لە گوزارشت و کـەموکووڕین، کـە جـوانی گـەورە لـە ژیـانی مرۆڤـدا گەنـدەڵ دەکـەن (یفـسد). سـەماکردن، پەیکەرتاشـی، وێنـەی ڕووت، قـژی واڵا، ئـەو چـیرۆکانەی باسـی هەڵـچوونی جەستە دەکەن (فوران الجسد)، موزیکی دەنگ زل (صاخب) کە گوزارشت لە هەڵچوونی تامەزرۆیی جەستە دەکات، یان ئەو سینەما ڕووتەی گشت ئەوانـە

کۆدەکاتەوە و دەیانخاتەڕوو، گشتیان زێدەڕۆیین لە ڕووی بەرجەستەکردنی جەستە و نیشاندانی بۆ و رووژاندنی ئارەزووەکان، یان پەرستن و پیرۆزکردنی.

ئاوازی مرۆڤ (اللحن الانساني) ئاوازێکی هەمەلایەنانەیە (متکامل) گوزارشت لە مرۆڤ دەکات بە گشت لایەنەکانیەوە، نەك تەنیا لە جەستە.[109]

جوانی، نیعمەتێکی خواییە بۆ مرۆڤەکان. بەکارهێنانی نیعمەت بۆ ئەو بوارەی بۆی دروستکراوە، سوپاسگوزاریی خوایە لەسەر نیعمەتەکە، چوونکە گەشەپێدانی هەستی جوانی لە مرۆڤی باوەڕداردا، پەرەپێدانی توانا و بەهرەکانیەتی کە خوا پێی بەخشیوە، ئەوەش سوپاسکردنی خوایە بۆ ئەوەی پێی بەخشیوە. بەکارهێنانی ئەو بەهرانە بۆ چێژ وەرگرتن لە دروستکراوەکانی خوا لە بوونەوەردا، لە نیشانەکانی ڕازاندنەوە و جوانیی سوپاسکردنی خوایە لەسەر نیعمەتی دروستکردنی ئەو جوانییە. خوا دەفەرموێ: (**وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ**) [الضحى: ١١] پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمویەتی: ((ان الله يحب ان يرى اثر نعمته على عبده)).[110] خوای گەورە بینینی ئاسەواری نیعمەتەکانی لەسەر بەندەکانی پێ خۆشە.

ب- دەکرێ یەکێك لە حیکمەتەکانی مەبەستی جوانی، پەروەردەکردنی موسڵمان بێت لەسەر خۆشویستنی جوانی و هەوڵدان بۆ جوانی. لێرەدا فریشك و پەروەردە یەکدەگرنەوە، ئەوەش ڕێخۆشکردن و زەمینەسازییە بۆ قەبووڵکردنی جوانیی ڕەها، جوانیی خوای گەورە و باوەڕپێهێنانی. کەسێك

---

[109] منهج الفن الاسلامي لا: ٩٥-٩٦.

[110] پێشتر باس کرا.

لەسەر جوانی پەروەردە بکرێت، بەبێ جوانی ڕازی نابێت لە هزر و ڕەفتار و ژیانی بە تێکڕایی، چوونکە خوا جوانە و جوانیشی خۆشدەوێ.

ج– گەشەپێدانی هەستکردن بە جوانی، هەر وەکو دەبێتە هۆی ناسینی خوای گەورە، لە هەمان کاتدا دەبێتە هۆی ناسینی ڕاستییەکانی بوونەوەر و سروشت و دۆزینەوەی زانستەکان، چوونکە جوانی لە سیفەتەکانی سروشتە، ئیسلام لەو ڕاستییەدا پێش زانستی نوێ کەوتووە.

تیڕوانینی نوێی زانست بۆ جوانی، جیاوازە لەگەڵ تێڕوانینی کۆنی،. "تێڕوانینی کۆنی بۆ لای ئەوە دەچێت کە جوانی تایبەتمەندی و سیفەتی چاودێرە، نەك سیفەتی سروشت بێت، بەڵام تێڕوانینی نوێی زانست بۆ ئەو ڕاستییە گەڕایەوە کە ئیسلام جێگیری کردبوو، کە جوانی سیفەتی بوونەوەرە و بەشێکە لە پێکهاتەی ئەم جیهانە".[111]

زانای فیزیایی (لویس دوبروگلی) LouisedeBroglie[112] دەڵێ: "هەستکردن بە جوانی لە گشت سەردەمەکانی مێژووی زانستدا، ڕێنیشاندەر بووە و ڕێنمایی زانایانی کردووە بۆ توێژینەوەکانیان".[113] لێرەدا پەیوەندیی نێوان هونەر و زانستمان بۆ ڕووندەبێتەوە، زانست نهێنییەکان و وردەکارییەکانی سروشت لە ڕێگای هەستکردن بە جوانی دەدۆزێتەوە، هونەریش گوزارشت لەو جوانییە دەکات بە تێکەڵکردنی لەگەڵ هەستەکانی مرۆڤ و دیدی مرۆڤ.

---

[111] العلم في منظوره الجديد لا: ٦٩.

[112] زانای فیزیایی فەرەنسی، لە ساڵی ١٩٢٩ز خەڵاتی نۆبڵی بەدەستهێنا.

[113] العلم في منظوره الجديد لا: ٤٥

هایزنبێرگ[114] (Heisenberg) دەڵـێ: "بـە ڕاسـتی جـوانی لـە زانسته وردەکانە و لە هونەردا بە یەکسانی گرنگترین سەرچاوەیە لـە سەرچـاوەکانی ڕووناکی و ڕوونی"[115] قورئان ئاماژەی بەو ڕاستییە کـردووە:( أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا و مِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ و حُمْرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا و غَرَابِيبُ سُودٌ ، و مِنَ النَّاسِ و الدَّوَابِّ و الْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ) [فاطر: ٢٧–٢٨] . واتە: ئایا نەتدی کە بەڕاستی خوا لە ئاسمانـەوە بـارانی باراندووە، ئینجا بەو بارانە هـەموو جۆرە میوەیـەکمان ڕوانـد کـە شـێوە و ڕەنگەکانیان جیاوازە و لە چیاکاندا چەند ڕێگـا هەیـە، کـە ڕەنگیـان سـپی و سـوورە (سـپی و سـوورەکانیش جیـاوازن) هەشـیانە ڕەشـێکی تۆخـە، لـە ئادەمی و زیندەوەر و ئاژەڵ و ماڵاتیشدا ڕەنگی جۆراوجۆر هەیـە بـە وێنـەی جیـاوازی میوەهـات، بەڕاسـتی لـەناو بەنـدەکانی خـوادا تـەنیا زانایـان (وەك پێویست) لە خوا دەترسن، بێگومان خوا زاڵی لێبوردەیە.

کە وابوو زانست، جوانی لە ڕێگای هەستکردن بە جوانییەوە دەدۆزێتەوە، ئەو هەستەش بەرەو دۆزینەوەی ڕاستییەکانی زانستمان دەبات. ترسـی خـوا دڵی زانایان پڕ دەکات و ترسیان دەبێت لە دەرچوون لە سیـستەمی جـوانیی بوونەوەر، ئەگەر کیتابی بینراوی خوا لەوپەڕی جوانیدا بێت، تێگەیشتن لـەو جوانییە ناکرێ تەنیا بە جوانی نەبێت، کە وابوو ئاوازی مرۆیی تەواو (کامـل) نابێ تەنیا لەژێر سێبەری جوانیی کیتابی خوێندراوی خوادا نەبێت.

٧– پیشەسازی و کارسازی:

---

[114] زانای فیزیایی ئەڵمانی، لە دانەرانی بیردۆزەی (الکم) لە ساڵی ١٩٣٢ز خەڵاتی نۆبلی پێ درا.

[115] العلم في منظوره الجديد، لا: ٤٦.

لەم سەردەمەدا پاڵنەری ئابووری بووەتە پێشەنگی مەبەستەکانی هونەر، بەرهەمی هونەری سامانێکی زۆر بەدەستدێنی، بە تایبەتی لە بواری سینەما و ڕاگەیاندندا .

ئیسلام نکووڵی لە پیادەکردنی هونەر بۆ مەبەستی کارسازی و پیشە ناکات، ئەگەر لە چەارچێوەی شەرع دەرنەچێت. پیاوێك پرسیاری لە ئیبن عەباس کرد (رضي الله عنه) دەربارەی بەدەستهێنانی ماڵ و سامان لە ڕێگای وێنەکێشانەوە، ئەویش فەرمووی: "ان أبيت الاّ تصنع فعليك بهذا الشجر، كل شيء ليس فيه روح".[116] واتە: دەتەوێت ئەو کارە هەر بکەیت، ئەوە درەخت و هەموو شتێك وێنە بکە کە گیانلەبەر نەبن. بۆیە زانایان بڕیاریان داوە بە دروستیی کارسازی و بەدەستهێنانی سامان لە ڕێگای پیادەکردنی هونەری پابەند بە ڕێساکانی شەرعەوە.

ئیمامی نەوەوی دەفەرمووێ: "وێنەکێشانی درەخت و بازرگانی بە وێنەکێشانەوە حەرام نییە".[117] جگە لەوەی بەجێگەیاندنی هەر کار و پیشەیەك، پێویستە لەوپەڕی پلەی ڕێکی و جوانیدا بێت، هەر ئەوەش مەنهەجی ئیسلامە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ: "بەڕاستی خوای گەورە پێی خۆشە ئەگەر یەکێکتان کارێکی ئەنجام دا، بە ڕێکی ئەنجامی بدات".

ناکرێ لەم سەردەمەدا وێنای زۆرێك لە سەرچاوەکانی سامان بەبێ هونەر بکەین، وەکو: بەرنامەکانی کۆمپیوتەر و ئامێرەکانی میکانیکی و ئەلکترۆنی و نەخشەی شار و تەلارەکان... هتد، چوونکە هونەر چووەتە ناو زۆربەی

---

[116] صحيح البخاري مع شرحه فتح الباري، ژمارەی فەرموودە: ٢٢٢٥، بەرگی: ٤، لا: ٥٢٥، صحيح مسلم مع شرح النووي، ژمارەی فەرموودە: ٢١١٠، بەرگی: ١٤، لا: ٧٨.

[117] شرح صحيح مسلم، بەرگی: ١٤، لا: ٧٧.

پیشەسازییەکان و پرۆژە وەبەرهێنراوەکان و بەرهەمهێنراوەکان، کە گشتیان پێویستیان بە نەخشە و دیزاینی هونەری هەیە، کە هیچ میللەتێك ناتوانێت لەم ڕۆژگارەدا دەستبەرداری بێت، ئەگەر مەبەستی بێت سیستەمێکی ئابووری و دارایی بنیات بنێت بۆ ئەوەی بە سەربەخۆیی و بە سەربەرزی بژی.

٨- گوزارشت کردن لە هەست و دەربڕینی بیروڕاکان و نیشاندانی هزر و بابەتە گرنگەکان:

یەکێك لە مەبەستەکانی هونەر و ئەرکەکانی کە لەگەڵ ئاییینی ئیسلامدا دەگونجێ، دەربڕین و گوزارشت کردنە لە ئازارەکانی ناخ و بیروڕا و هزرەکان. هونەر ئامرازە نەك مەبەست. هونەر بۆ هونەر نییە، بەڵکوو هونەر بۆ خزمەتی ڕاستی و بەهای جوان و دادپەروەرییە. هونەری ئیسلامی ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە نیشاندان و خستنەڕووی بیروڕاکان و گوزارشت کردن لە هەستەکان، بەوەش دەتوانێت خزمەتی بابەتە گرنگەکانی کۆمەڵگا بکات و بە زمانی هونەر پەیامەکەی بگەیەنێتە جیهان.

کۆمەڵگەی ئیسلامی بابەتی گرنگ و قورسی لەبارە لە تەرازووی شارستانی و مێژوویدا. ئەگەر هونەر -بە چەمکە گشتییەکەی- پەیامی بێدارکردنەوەی کۆمەڵگە نەگەیەنێت و سەرنجی ڕانەکێشێت بۆ کێشەکانی و دەستنیشانکردنی هۆکارەکانی، لە پاشان دانانی چارەسەری گونجاو و گرنگیدان بە ئاراستەکردنی و زە و تواناکان بە وردی و ئەمانەتەوە، ئەو کاتە -بەبێ گومان- دەبێتە یەکێك لە بەربەستەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵگە و دواکەوتنی.

## ٩- دەربڕینی خۆشی لە بۆنەکاندا

چەندان دەقی شەرعی دەربارەی بەکارهێنانی هونەر لە بواری دەربڕینی خۆشی لە بۆنەکانی وەکو: ئاهەنگی هاوسەرگیری و جەژنەکان و گەڕانەوە لە سەفەردا بە سەلامەتی (عودة الغائب) هەن. لەو نموونە بەناوبانگانە، ئەوە بوو کە ئەنسارییەکان بە سروودی (طلع البدر علينا من ثنيات الوداع)، پێشوازییان لە پێغەمبەر (ﷺ ) کرد، ئەو ڕۆژەی گەیشتە مەدینە، یان لە کاتی گەڕانەوەی لە تەبووك[١١٨].

"ئەم وێنانە و وێنەی دیکەش، ئیسلام دانی پێدا ناوە و بە باشی زانیوە لە بۆنە خۆشییەکانی وەکو: ڕۆژانی جەژن و هاوسەرگیری و گەڕانەوەی گەشتیار (غائب) و لە کاتی داوەت (عقيقة) و لە دوای لەدایکبوونی منداڵ و ...هتد". [١١٩] بەکارهێنانی هونەر وەکو ئامرازێك بۆ حەسانەوەی دڵ و دەروون، بۆ یارمەتیدان لەسەر نوێکردنەوەی چالاکیی جەستە و زیندوویی دڵ، یان بە مەبەستی (تنفيس) و دەربڕینی هەندێ کاردانەوە و هزر، لە مەبەستەکانی شەرعن. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((خذوا يا بني أرفدة[١٢٠]، حتى تعلم اليهود و النصارى أن في ديننا فسحة)).[١٢١] کاتێ هەندێ حەبەشی یارییان دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بگرن نەوەکانی ئەرفەدە، بۆ ئەوەی جوولەکەکان و گاورەکان بزانن کە لە ئاییینماندا فراوانی

---

[١١٨]ابن القيمپێی وایە ئەو سروودە لە پێشوازی پێغەمبەرو سوپای موسلمانان گوتراوە کاتێ لە غەزای تەبووك گەڕانەوە.، زاد المعاد لا: ٦٤٥.

[١١٩]الفن الواقع و المأمول، لا: ٢٠٢.

[١٢٠]بني أرفدةنازناوی حەبەشیەکانە، ناوی باپیرە گەورەیان بووە، بڕوانە: النهاية في غريب الحديث و الأثر، بەرگی: ٢، لا: ٢٤٢.

[١٢١]أخرجه أحمد، بڕوانە: مسند الامام أحمد بن حنبل. ، ژمارەی فەرموودە: ٢٤٨٥٥، بەرگی٤١، لا: ٣٤٩.، وقال محققه: حديث قوي.

هەیە. ئایین فراوانیی تێدایە، بانگەوازە بۆ تێگەیشتن لە ئایین و ڕەچاوکردنی فریشکی (فطرة) مرۆڤ.

بەڵام ئەوەی جێی باسکردنە لێرەدا، ئەوەیە کە نابێت ئەو دەقانە بکرێنە بەهانەیەك بۆ زاڵبوونی گەمە و بەسەربردنی کات و بەفیڕۆدانی لەسەر ژیانی موسڵمان، چوونکە مرۆڤ لە دیدی ئیسلامەوە بۆ ئەوە خەلق نەکراوە کات بە گەمە و ڕابواردنەوە بەسەر ببات، بەڵکوو بۆ ئەوە خەلق کراوە کار بکات و خۆی ماندوو بکات، بەڵام خۆشی دەربڕین و حەسانەوەی بیر و هۆش و دڵ و جەستە، فراوانییە لە ئاییندا و یارمەتیدەرە بۆ نوێکردنەوەی چالاکی. دڵ و دەروونی مرۆڤیش ماندوو و بێزار دەبێت ئەگەر شتێکی لە یاری و خۆشیی دروستی پێ نەدرێت.

هونەری ئیسلامی ئەو مەبەستە بەرز و جوانانە بەدیدێنێ کە سوودەکەی بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بە گشتی دەگەڕێتەوە، بۆیە پێویستە ئەهلی هونەر و شەرع، هەڵسن بە پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە لە کەلێنەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی و ئاگادار بن لەم ڕێگایەوە هەڕەشە لەسەر ئیسلام دروست نەبێت. کاتی ئەوە هاتووە تیۆریی هونەری ئیسلامی دابمەزرێنین و گشت ڕەهەند و مەبەستەکانی شەرع لەو بوارە گرنگەدا کارا بکەین، بۆ ئەوەی بەشدار بین لە لایەنێکی گرنگی ڕابوونی ئیسلامی و گەڕاندنەوەی پێشەنگی بۆ شارستانیەتی ئیسلامی.

# کۆتایی

لـــه دوای ئـــەم گەشـــتە بـــەناو بابەتـــەکانی ئـــەم نووســـینەدا، بۆمـــان دەردەکـــەوێت کـــە زۆر بـــواری هونـــەری لـــە شـــەرعدا دروســـتن و تەنانـــەت کەڵکیشیان بۆ بنیاتنانی بیردۆزەی هونەری ئیسلامی لێ وەردەگیرێت، ئـەو جۆر هونەرانەی دروستیش نین لە شەرعدا، نابنە ڕێگر لەبەردەم گەشەکردنی هونەری ئیسلامی و کاریگەریی ئەوتۆیان نابێت، چوونکە ئەو جـۆرە هونـەرە ڕێپێنەدراوانە، جێگرەوەیان لە شێوازی دروست و مەبەسـتی دروست هەیـە، لەگـەڵ ئـەوەش دەبێتـە تایبەتمەنـدییێکی هونـەری ئیـسلامی کـە ئاراسـتەی تایبەتی خۆی لە داهێنان و جوانی دەبێت.

گرنگیـدان بـەو هونـەرە و گەلالـەکردنی، خزمـەتێکی زۆر بـە بانگـەوازی ئیسلامی دەگەیەنێت و بواری هونـەر دەوڵەمەنـدتر دەکـات و چـینێکی زۆری هونەرمەنـدان و هونەردۆسـتان لـەخۆ دەگرێـت و دووریـان دەخاتـەوە لـە کاریگەریی هونەرە ناشەرعییەکان. هـەروەها خزمـەتێکی زۆر بـە مرۆڤایـەتی دەگەیەنێت، کە هونـەرێکی پەیامـدار و پابەنـدبوو بـە پەرەپێـدانی ڕەوشـتی بـەرز و بـەهای بـەرز نیـشانی جیهـان دەدات، هـەروەها جـوانیی ڕاسـتەقینە دەردەخات و پـەردە لەسـەر ڕازاندنـەوە و جـوانیی ڕووکـەش هەڵدەداتـەوە، بەوەش بوارێکی دیکە لە بوارەکانی ژیانی موسـڵمانان ڕێکدەخاتـەوە لەسـەر پابەندبوون و ڕەچاوکردنی دیدی ئیسلام بۆ بوونەوەر و جوانی.

# سەرچاوەكان


١– ابن زكريا، أبو الحسين أحمد بن فارس، معجم مقاييس اللغة، مصر: چاپخانەی مصطفى البابي الحلبي و أولاده، چاپی یەکەم، ١٩٧٢ز.

٢– ابن عاشور، محمد بن الطاهر:

– التحرير و التنوير، بيروت: مؤسسة التاريخ العربي، چاپی یەکەم، ٢٠٠٠ز.

– مقاصد الشريعة الإسلامية، تونس: الشركة التونسية للتوزيع، چاپی یەکەم، ١٩٧٨ز.

٣– ابن كثير، أبو الفداء إسماعيل بن عمر القرشي الدمشقي (٧٠٠ –٧٧٤ هـ )، تفسير القرآن العظيم، تحقيق: سامي بن محمد سلامة، دار طيبة للنشر والتوزيع، چاپی دووەم، ١٤٢٠ك– ١٩٩٩ز.

٤– ابن اللحام، أبي الحسن علاء الدين بن محمد بن عباس البعلي الحنبلي، القواعد و الفوائد الأصولية، بيروت: دار احياء التراث العربي، چاپی یەکەم ، ١٤٢٣ك–٢٠٠٢ز.

٥– ابن منظور، أبو الفضل جمال الدين محمد بن مكرم، لسان العرب، بيروت: دار صادر، د. ت. بيروت: دار الكتب العلمية، چاپی یەکەم، ٢٠٠٣ز.

٦– أبو مليح، رجب، بين الفن و الفقه، بيروت: الدار العربية للعلوم ناشرون، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨ز.

٧– أبو ريان، محمد علي، فلسفة الجمال و نشأة الفنون الجميلة، الاسكندرية: دار المعرفة الجامعية، د. ت.

٨- أحمد بن حنبل، مسند الامام أحمد بن حنبل. بيروت: مؤسسة الرسالة، چاپی دووەم، ٢٠٠٨ز.

٩- م. أغروس، روبرت م، و ستانسو، جورج ل، العلم في منظوره الجديد، ترجمة: كمال خلايلي، الكويت: المجلس الوطني للثقافة و الفنون و الآداب، سلسلة عالم المعرفة، عدد/١٣٤، ١٩٨٩ز.

١٠- أكبر، جميل عبد القادر، عمارة الأرض في الاسلام، بيروت: مؤسسة الرسالة، چاپی سێیەم، ١٩٩٨ز.

١١- الالباني، محمد ناصر الدين، سلسلة الأحاديث الصحيحة و شيء من فقهها و فوائدها، الرياض: مكتبة المعارف، ١٤١٥ك.

١٢- البخاري، محمد بن اسماعيل، صحيح البخاري مع شرحه فتح الباري، دمشق: دار الفيحاء، الرياض: دار السلام، چاپی سێیەم، ٢٠٠٠ز.

١٣- البرهاوي، رعد محمد، الغناء و الموسيقى بين الحلال و الحرام، العراق: مركز البحوث و الدراسات الاسلامية/ ديوان الوقف السني، چاپی یەکەم ، ٢٠١٠ز.

١٤- البهنسي، عفيف، الفن الاسلامي، دمشق: دار طلاس، چاپی دووەم، ١٩٩٨ز.

١٥- البيهقي، أبو بكر أحمد بن الحسين (توفي ٤٥٨هـ)، شعب الايمان. بيروت: دار الكتب العلمية، چاپی یەکەم، ٢٠٠٠ز.

١٦- الترمذي، سنن الترمذي. مع شرحه تحفة الأحوذي، بيروت: دار الكتب العلمية، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥ز.

١٧- الجريسي، خالد بن عبد الرحمن، الفن، الواقع و المأمول، الرياض: مؤسسة الجريسي للتوزيع و الاعلان، ١٤٢٧ك.

١٨– الجوزية، شمس الدين ابن القيم، أعلام الموقعين عن رب العالمين، القاهرة: دار الحديث، ٢٠٠٣ز.

١٩– زاد المعاد في هدي خير العباد، بيروت: دار الكتاب العربي، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥ز.

٢٠– روضة المحبين و نزهة المشتاقين، دارالكتبالعلمية – بيروت، ١٤١٢ك – ١٩٩٢ز.

٢١– الخادمي، نور الدين بن مختار، علم المقاصد الشرعية، الرياض: مكتبة العبيكان، چاپی سێیەم، ٢٠١٠ز.

٢٢– الدلال، سامي محمد صالح، القواعد الشرعية لادارة الصراع الحضاري بين الأمة الاسلامية و سواها من الأمم، القاهرة: المركز العربي للدراسات الانسانية، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨ز.

٢٣– رفاعي، أنصار محمد عوض الله، الأصول الجمالية و الفلسفية للفن الاسلامي، (رسالة دكتوراه، جامعة حلوان، ٢٠٠٢ز).

٢٤– الزحيلي، و هبة، التفسير المنير في العقيدة و الشريعة و المنهج، بيروت: دار الفكر، چاپی دووەم، ٢٠٠٥ز.

٢٥– الزرقا، أحمد بن الشيخ محمد، شرح القواعد الفقهية، دمشق: دار القلم، چاپی شەشەم، ٢٠٠١ز.

٢٦– سيد قطب، في ظلال القرآن. القاهرة: دار الشروق، چاپی دەیەم، ١٩٨٢ز.

٢٧– السيوطي، أبي الفضل جلال الدين عبد الرحمن، الأشباه و النظائر في قواعد و فروع فقه الشافعية، دار الفكر–بيروت، چاپی سێیەم.

٢٨- الشاطبي، أبو اسحاق ابراهيم بن موسى اللخمي، الموافقات في أصول الشريعة، القاهرة: المكتبة التوفيقية، د.ت.، الاعتصام، بيروت: المكتبة العصرية، ٢٠٠٢ز.

٢٩- الشامي، صالح أحمد:

- ميادين الجمال في الظاهرة الجمالية في الاسلام، بيروت: المكتب الاسلامي، چاپى يەكەم، ١٩٨٨ز.

- الظاهرة الجمالية في الاسلام، بيروت: المكتب الاسلامي، چاپى يەكەم، ١٩٨٦ز.

- الجمال في منهج الاسلام و تشريعه، الرياض: دار كنوز أشبيليا، چاپى يەكەم، ٢٠٠٧ز.

٣٠-عباس، راوية عبد المنعم، الحس الجمالي و تأريخ الفن، بيروت: دار النهضة العربية، چاپى يەكەم، ١٩٩٨ز.

٣١- عماد الدين خليل، مدخل الى الحضارة الاسلامية، بيروت: الدار العربية للعلوم، چاپى يەكەم، ٢٠٠٥ز.

٣٢- عمارة، محمد، الاسلام و الفنون الجميلة، القاهرة: دار الشروق، چاپى يەكەم، ١٩٩٩ز.

٣٣- العمري، علي بن حمزة، الفن المعاصر، بيروت: دار ابن حزم، چاپى يەكەم ، ٢٠١٠ز.

٣٤- الغزالي، أبو حامد محمد بن محمد، احياء علوم الدين، بيروت، دار و مكتبة الهلال، چاپى يەكەم، ٢٠٠٤ز.

٣٥- الغزالي، صالح أحمد، ممارسة الفن في الشريعة الاسلامية، رسالة ماجستير-جامعة أم القرى، ١٤١٤ك.

٣٦- الفيروز آبادي، مجد الدين محمد بن يعقوب، القاموس المحيط، بيروت: دار إحياء التراث العربي، چاپی یەکەم١٤٢١ك - ١٩٩١ز.
٣٧- القرطبي، أبو عبد الله محمد بن أحمد الأنصاري، الجامع لأحكام القرآن، القاهرة: دار الحديث، ٢٠٠٥ز.
٣٨- القرني، للدكتور عوض بن محمد، المختصر الوجيز في مقاصد التشريع، جدة: دار الأندلس الخضراء، چاپی یەکەم، ١٩٩٨ز.
٣٩- القضاة، أحمد مصطفى علي، الشريعة الاسلامية و الفنون، بيروت: دار الجيل، عمان: دار عمار، چاپی یەکەم، ١٩٨٨ز.
٤٠- المرعشلي، محمد عبد الرحمن، الغناء و المعازف في الاعلام المعاصر، بيروت: دار المعرفة، چاپی یەکەم.
٤١- محمد قطب، منهج الفن الاسلامي، القاهرة: دار الشروق، چاپی دووەم، ٢٠٠٦ز.
٤٥- محمود، علي عبد الحليم، التربية الجمالية الاسلامية، القاهرة: دار التوزيع و النشر الاسلامية، چاپی یەکەم، ٢٠٠٣ز.
٤٦- الموصلي، أبو يعلى أحمد ابن علي (توفي ٣٠٧هـ)، مسند أبي يعلى. بيروت: دار الفكر، ٢٠٠٢ز.
٤٧- النسائي، أبي عبد الرحمن أحمد بن شعيب، سنن النسائي، بيروت: دار الكتب العلمية، چاپی دووەم، ٢٠٠٥ز.
٤٨- الهيثمي، نور الدين علي بن أبي بكر بن سليمان (توفي ٨٠٧ هـ)، مجمع الزوائد و منبع الفوائد. بيروت: دار الكتب العلمية، چاپی یەکەم، ٢٠٠١ز.
٤٩- مجلة الأزهر، مانگی ڕەجەب، ١٣٧٠ك.
٥٠- مجلة البيان ژمارە: ٥٠.

# سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی




سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا، لە سۆنگەی ئەوەوە کە هزر و بیری ڕەسەن و قووڵ بنچینەی تێگەیشتنی ڕاست و دروستە بۆ دەقەکانی قورئان سوننەت و دەستەبەری لێکدانەوەی گونجاوە بۆیان، سەنتەر هەوڵی ڕەخساندنی کەشوهەوای گونجاو دەدات بۆ کارابوونی عەقڵ و بیر و ڕانانی هزریی، لەم پێناوەدا سەنتەر هەردوو سەرچاوەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی بەرز و بەڕێز بە بەکارهێنانی ئامرازی زانستە ئیسلامییەکان و زانستە کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان دەکاتە بنەمای کارەکانی.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

ـ بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانکۆیی و پەروەردەییەکاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.

ـ پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.

ـ كاراكردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.

ـ پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.

ـ سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.

**بوارەکانی کارکردن:**

ـ نووسین بە قەڵەمی خۆماڵی نووسەرانی کورد و بیرمەندان.

ـ وەرگێڕان لە زمانە جیاوازەکان بۆ زمانی کوردی  لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کلتووری کوردی.

ـ بەستنی کۆڕ و سازدانی سیمینار لەلایەن خاوەن بیر و ئەکادیمیانەوە.

ــ خولی ڕاهێنان و ۆرکشۆپ لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی زانکۆییەوە.

ـ هاوکاریکردنی دامودەزگا و دامەزراوە ئەکادیمییەکان و زانکۆکان لە پێناو پەرەپێدانی ئاستی زانستی.